# ئەدۆب
# فۆتۆشۆپ سی ئێس
# Adobe Photoshop CS

هێمن مەلا کەریم بەرزنجی

٢٠٠٦




ئەم وێنەیەی سەرەوە پێکهاتەی بەرنامەی ئەدۆب فۆتۆشۆپ سی ئێس ڕووندەکاتەوە ،کە بەوردی و،لەدووتوێی ئەم کتێبەدا هەموو بەشەکان شیکراونەتەوە.




**فەرمانی color replaceواتە دانانی ڕەنگ لەبری و،بەم شێویەکاری پێدەرێت :**

١-ئەگەربمانەوێت ڕەنگێك لەهەموو وێنەکادا بگۆڕین، ئەوادوار ئەوەی وێنەکەمان کردووە، چوینە سەر ئەم فەرمانەدەبینین وێنەکە لەبەشێکی پە نجەرەکەدا بەتەواوی کراوەتەوەو،لەبەشیselectionدا ئەورەنگە هەڵدەبژێرین کەدەمانەوێت بیگۆڕین، پاشان دەچینە سەر بەشی گۆڕانکاری ولەجیاتی دانانیreplacementو،دەستکاری وێنەکەدەکەین بەهۆی هەرسێبەشیhue/saturation/lightness وەك لە پێشترو لەفەرمانەکانی تردا باسکراوە.

بۆ زیاتر زانیاری سەیری پێکهاتەو...ناوەڕۆکی کتێبەکەی بەردەستت بکە و،بەوردی بیخوێنەرەوەو فەرمانەکانیشی جیبە جێبکە.

ئەم وێنەیە هەردوو شێوەی نووسینو،فەرمانی Brush و شێوەکانیشی ڕوون دەکاتەوە کەزۆر بەوردی و بەجوانی لە دوو توێی ئەم کتێبەی بەردەستتدا باسکراوەو ،دەتوانێت بەئاسانی لێی تێبگەیت و،بەکاریان بهێنێت و،شێوەو کاری زۆر لەم نموونەیە جوانتر و،نایابتر بنەخشێنێت.






Wave :بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین شێوەی شەپۆلی
بەیەکدا چوو ،و حەسیری چنراو بنەخشێنین و،لەو شوێنەدا
دای بنێین کەدەمانەوێت ،یان بۆ هەموو باکگراوەندەکەو
،دوواتر کاری لەسەر بکەین؛
بۆ زیاترزانیاری پێکهاتەو...ناوەڕۆکی ئەم کتێبە بخوێنەوە




بەرنامەی ئەدۆبی Browserئەم وێنەیە پێکهاتەو ...بەشەکانی بگەڕی
فۆتۆشۆپی سی ئێس ( هەشت )ڕووندەکاتەوە،بۆیە بۆزیاتر زانیاری لەبەشەکانی ئەم

هێمن مەلا کەریم بەرزنجی

# فۆتۆشۆپ سی ئێس

(هەشت و....نۆ)



Adobe Photoshop CS.lnk

بەشی یەکەم و ...دووەم

بۆهەرسێ ئاستی سەرەتایی و ناوەندی و پێشکەوتووان

بە شێوەیی فێربونی سەردەمییانە

بە فێربوونی وێنەیی و...کردارییانە

**بێدەنگی لە چەنەبازەوە فێربووم...وهەوڵدان لەتەمەڵەوە...وهێمنی لەلوت بەرزەوە،زۆر سەیرە من ڕێزی ئەم مامۆستایانەم ناگرم........!!**

**جۆزێف جۆبێر**

**ئەم بەرهەمەپێشکەشە بە:-**

*ئەو مرۆڤەی پڕبەدڵ خۆشمەویست و،بەشێکبوولەخەونەکانم.

*ئەو مرڤەی پێیوتم:ژیان بە لەدەستدانی خۆشەویستەکەت مەدۆڕێنە .چونکە لەهەمووشتێك گەورەترە.

*ئەوانەی فێریانکردم بەردەوام بنووسم و بخوێنمەوە.

*هەموو ئەوانەی بوونە بەشێك لە یادگاری و بیرەوەرییەکانم.

* کتێبی:فۆتۆشۆپ سی ئێس (هەشت-نۆ)

*ئامادەکرن و نوسینی :هێمن مەلا کەریم بەرزنجی

*پیتچنین:نووسەر.

*تیراژ:٢٠٠٠دانە.

*شوێنی چاپ: سلێمانی ٢٠٠٥،سلێمانی ٢٠٠٦

*چاپی یەکەم:٢٠٠٥

چاپی دووەم:٢٠٠٦

*نەخشەسازی ناوەوە:نووسەر.

*چاپخانەی:ئارام

ژمارەیی سپاردنی(٣٠٣)ی ساڵی ٢٠٠٥



**کتێبی دووەمی نووسەر .**

## پێشەکی چاپی دووەم:



## هێمن مەلا کەریم بەرزنجی

***پێویستە بەرلە هەموو شتێك بە خوێنەرانی خۆشەویست و،عاشقانی ڕێگەی زانست و زانیاری تەکنیکی کوردی ڕابگەیەنم کە*** **،بێگوومان لە چاپدانەوەی ئەم کتێبە بەشێك دەبێت لە خزمەتکردن بە بواری کۆمپیوتەرو،ئینتەرنێت و،زانیاری تەکنیکی و،لە چاپدانەوەشی دەگەرێتەوە بۆ داواکاری ئێوەی خوێنەرو،زانست خواز،و ئەمە جگە لەوەی  خۆشم لە چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەڵێنم دابوو کە ئەگەر خوای گەورە تەندروستیم باش بکات و ،ساغ و بێگرفت بم ،ئەوا دەگەرێمەوەی لای فۆتۆشۆپ و زیاتر پەرەی پێدەدەم ،هەربۆیە لەم چاپەدا هەوڵم دا بەتەنها چاپکردنەوە نەبێت،بەڵکو بە جێگەیاندنی ئەو بەڵێنەش بێت .ئەگەرچی  هێشتاکە بە بەرهەمێکی تەواو و بێکەم و کوری نادەمە قەڵەم و ،ئەگەر تەمەن هەبێت ،پشت بە خودا لە چاپی ئایندەدا هیچ هەڵەو کەمو کورتییەکی تیادا نامێنێت و،تەواوی ئەو بەشانەش ،کە لێرەدا باسکردنیمان بە گرنگ و ،پێویست نەزانیووەباسدەکەم.**

**وەلەم چاپەشدا هەوڵم داوە ئەوەندەی توانام بەسەریدا دەشکێت ،وردو لە سەر خۆبم لە شیکردنەوەی بابەتەکاندا  ،گەرچی باسکردن و،شیکردنەوەی تەواوەتی نییە،وەلێ بۆ خوێنەرو،وانست خوازی کورد تەواو سودمەندە.**

**جگە لەم بەرهەمە ی بواری وێنە لە ئایندەدا هەوڵدەدەم ،شیکاری بەرنامەی دیکەی ئەم بوارەبکەم و،ئەوەندەی کاتم هەبێت و،بە پێویستی بزانم ،یاخود تۆی خوێنەرو ،عاشقی ڕێگەی زانست بە ئیمەیل،یان بە تەلەفۆن داوام لێبکەیت ،وەك بەرنامەکانی فۆتۆئمپاکت و فۆتۆپڵەس و،کۆرڵدرۆو....**

**هەرلێرەوەش مژدە بە خوێنەرانی خۆشەویست دەدەم ،کە سەرجەمی کتێبەکانم کە ٣٥کتێبە  لەماوەی ٤مانگی ئایندەدا ،دەکەمە وێبلاگ و ،ماڵپەری تایبەتی ،بۆ ئەوەی خوێنەران و،بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت سودی لێوەر بگرن هەتاوەکو ئەو کاتەی هەلی لە چاپدانیان بۆ دەرەخسێت و،چاپدەبن .چونکە ئەگەر حکومەتی کوردستان هاوکاریم بکات لە بیری ئەوەدام بۆ ئەمساڵی خوێندن دەستبکەمەوە بەتەواو کردنی ئەو کاروانە پیرۆزە و ،بڕوانامەی بەرزتر بەدەست بهێنم و هەوڵبدەم بەئاواتی دڵی خۆم بگەم تادەگەمە پلەی پرۆفیسۆری ،بۆ ئەوەی بتوانم زیاتر خزمەتی کوردو ،گەنجانی کوردزوبان و ،زانستگە(زانکۆ) و دام و دەزگاکانی حکومەت  بکەم .**

Mobile: ٠٧٧٠ ١٥١ ٥٥ ٨٢(Asia cell)
٠٧٣٠ ١٢٢ ٠ ٥٢٤(sana tel)
E-mail:dr.hemn@yahoo.com
Weblog: www.hemnbarznji.blogfa.com

# بەرایی..

زانست خوازی هێژا،فێرخوازی خۆشەویست،ئەم بەرهەمەی لەبەردەستتدایە دووای هەوڵ وماندووبوون و،شەونخونییەکی زۆر وەبەرهەم هاتووە،کەبەهۆیەوە مافی هەندێك کەسمخواردووە،لەوانەش ئەومرۆڤەی پڕبەدڵ خۆشمدەوێت (خۆشم دەویست-٢٠٠٦)ئەمەجگەلەوەی تاڕادەیەکی کەم غەدرم لەخوێندنەکەشمکردووە،هەتاوەکو بتوانم بەردێکی بچوك بخەمەسەربناغەی زانستی تەکنەلۆجی کوردی ،کەئەگەربڵێین نییە ڕەنگە غەدربێت،وەڵ بوونی لەباری گاگۆڵکێدایەو ،پێموانیە بەمزووانەپێبگرێت.چونکە لەسەرەتایی کارکردنداین بۆی ،بۆیە نوسین و، وەرگێران ،وئامادەکردنی هەربەرهەمێك لەم بووارەداخزمەتێکی گەورە بەزانیاری تەکنیکی کوردیkit دەگەیەنێت ،ئەگەرچی بەرهەمەکەش تەواو ئەکادیمی نەبێت،چونکە تاهەنوکەش نەلەزانکۆو، نەلەپەیمانگاکاندا بەشی تایبەتمان نییە بەزانیاری بواری ئینتەرنێت و سەتەلایت و،ڕەنگە ناهەقی نەبێت ئەگەر زانستی کۆمپیوتەریش لەم ئاستەدا ئەژماربکەین ،چونکە بەداخەوە لەبەشی کۆمپیوتەری زانکۆ و، پەیمانگاکانداجگەلەجیلێك مامۆستا هیچی دیکەبەرهەمنایەت ،کەئەمەش بۆخۆی جۆرێکەلەگرفت.

دیارە بەرنامەی فۆتۆشۆپ زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت کەلێرەدا لێی دوواوین.چونکە بەرنامەی فۆتۆشۆپ زۆر بوار لەخۆدەگرێت لەوانە نەخشە سازی ماڵپەڕی ئینتەرنێتی و،دروستکردنی وێنەی جوڵاو زۆر شتی تر،کەهەندێك کتێبم لەبارەی فۆتۆشۆپەوە دیووە زیاتربووەلە٦٠٠لاپەرەی قەبارە گەورە،بۆیە پێموانی بەم کتێبە بچوکە بتوانین حەقی تەواو بە فۆتۆشۆپ بدەین،وەڵ بەڵێن بە خوێنەر دەدەم کەئەگەر تەندرووستیم باشبێ،پشتیوان بەخودای مەزن ودلۆڤان دووای بەرهەمەکانی داهاتوو کەچەند دانە کتێبە دەچمەوەسەر فۆتۆشۆپ و،بە چڕووپڕی و،زۆربەوردتر باسی دەکەم.

کوردستان-سلێمانی

مانگی ١٠ی٢٠٠٤

و...

مانگی ٢ی٢٠٠٥

# ناوەڕۆك

## ❖ بەشی یەکەم:



## ❖ بەشی دووەم:



## ❖ بەشی سێهەم:

### پەنجەرەکانی تەنیشتی

# ❖ بەشی چوارەم:

## ئەدۆب فۆتۆشۆپ پلەگین



# ❖ بەشی پێنجەم

## نموونە

# Adobe Photoshop cs &cs2 ئەدۆب فۆتۆشۆپ ٩و٨

## بەشـــی یــەکەم

- *دابەزاندنی فۆتۆشۆپ سی ئێس.*
- *کردنەوەو ...چونە ناو بەرنامەکە.*
- *ناساندن و...پێکهاتەی فۆتۆشۆپ.*
- *شریتی لیستەکان و ...پێکهاتەوفەرمانەکانیان.*
  - *لیستی فایل .*
  - *لیستی ئیدێت.*
  - *لیستی وێنە.*
  - *لیستی چینەکان.*
  - *لیستی هەڵبژاردن و دیاری کردنەکان.*
  - *لیستی فلتەر.*
  - *لیستی پیشاندان .*
  - *لیستی پەنجەرەکان.*
  - *لیستی یارمەتی.*



# ❖ دابەزاندنی بەرنامەکە

**١-سی دی**cd**بەرنامەی فۆتۆشۆپ سی ئێس بخەرەناو كۆمپیوتەرەكە:**

**بڕوانە وێنەی ١**



**٢-دووانە كلیك** double click **لە سەر** my computer **بكە لە سەر ڕووی شاشەكە**desk top:

**بڕوانە وێنەی٢**




## ✓ سەرنجـــــــا ــــــــــــ :

**دەتوانین** my computer **بەهۆی كلیكی ڕاست** right click **كردن لە سەر شۆرت كەتی مای كۆمپیوتەر** my computer **لەسەر ڕووی شاشەكە** desk top **بكەینەوە ،كە بەهۆی كلیكی ڕاستەوە لیستێكمان بۆ دەكرێتەوە و،پاشان سەهمی ماوسەكە دەگوێزینەوە بۆ سەر** open **یان** explorer **و كلیكی لەسەر دەكەین بەمەش هەمان كاری خاڵی ٢-مان بۆ جێبەجێدەبێت.**

بڕوانە وێنەکە




✓ سەرنجـــــــــ٢ـــــــــ:

جگە لەو دوو شێوەیەی سەرەوە هاوکات دەتوانین بەم شێوەیەش my computer بکەینەوە،ئەویش بەکلیک کردن لەسەر دووگمەی دەستپێکردنstartلەسەر بەشی تاسک باریtask barسەر ڕووی شاشەکەو ،پاشان گواستنەوەی سەهمی ماوسەکە بۆ سەر all programیان programsو،دوواتر گواستنەوەی سەهمی ماوسەکە بۆ سەر فۆتۆشۆپ سی ئێس و کلیک کردن لەسەری .

*بڕوانە وێنەکە*



٣–بەهۆی  کلیکی ڕاست و پاشان کلیك کردن لەسەر openیان explorerسی دی –یەکە بکەرەوە:

بڕوانە وێنەی٣




٤– دووای کردنەوەی سیدییەکە دووانە کلیك لەسەر هێمای دابەزاندنی بەرنامەی فۆتۆشۆپ سی ئێس بکە  یان کلیکی ڕاست و پاشان کلیك لەسەر openبکە :

بڕوانە وێنەی ٤



٥-دەبینیت دابەزاندنی بەرنامەی فۆتۆشۆپ سی ئیس چالاك دەبێت و،لەسەر ڕووی شاشەکە دەردەکەوێت و،بەهۆی بەجێگەیاندنی ئەم هەنگاوانەی دوواتر بەرنامە کەدادەبەزێت:

وێنەی ٥




پاشان ئەم بارەی لای خوارەوە دروست دەبێت و،چاوەڕێدەکەین تا چوار گۆشە سەوزە بچوکەکان تەواو دەبن و قۆناغی دوواتر دەردەکەوێت.

وێنەی ٦



پاش کەمێك چاوەڕوانی ئەم شێوەیەی خوارەوە دەردەکەوێت:

وێنەی ٧




✓ *سەرنجـــ٣ـــــ*

*که کلیك لەسەرنێکست دەکەیت دایەلۆگ بۆکسێکت دەداتی کەدەبێت کلیکی یەس Yesبکەین.*

٦- کلیك لەسەرnextبکە،کەبەهۆیەوە ئەم دایەلۆگ بۆکسەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە.

بڕوانە وێنەی ٨



٧-كليك لەسەر دووگمەی nextدەكەين و ئەم دايەلۆگ بۆكسەی خوارەوەمان بۆ دەكرێتەوە:

وێنەی ٩




٨-كليك لەسەر Acceptدەكەين و،ئەم دايەلۆگ بۆكسەی خوارەوەمان بۆ دەكرێتەوە:

وێنەی ١٠




*لە خانەی first nameدا ناوێك بنوسەو لەخانەی last nameدا ناوێكی دی بنووسە.

*لەخانەی companyدا ناوی كۆمپانيايەك بنوسە،يان باهەر ناوی ئەو كۆمپانيايەی تيابێت كەخۆی نووسراوە تيايدا.

*لەخانەکانی serial numberدا سیریاڵ نەمبەری بەرنامەکە بنووسە کەلە cdیەکەداهەیە،ئەگەر خۆی نەنووسرابوو تیایدا.

٩-کلیکی دووگمەی Nextبکە،کەبەهۆیەوە ئەو پەنجەرەیەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە:

بڕوانە وێنەی ١١




١٠-کلیك لەسەر دوگمەی Yesبکە،کەبەهۆیەوە ئەم پەنجەرەیەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە :

بڕوانە وێنەی ١٢




***ڕاستەوخۆ*** بەرنامەی فۆتۆشۆپ سی ئێس دادەبەزێت بۆ بەشی پرۆگرام فایل و،دەبێتە بەشێك لێی لە فولدەرێکی تایبەتدا بەناوی ئەدۆب ،و ئەم بەشی پرۆگرام فایلەش بەشێکە لە هاردی سی و،بەرنامەکانی کۆمپیوتەرەکەش بە کۆمەڵەی ئۆفیس و،تەنانەت ویندۆش لە خۆدەگرێت،وە بەسڕینەوەی ئەو بەرنامەیە لە کۆنترۆڵ پەناڵەوە لێرەوا لادەچێت و،نامێنێت ،وەڵێ ئەگەر بەتەنها شۆرت کەتەکەی shortcutبسڕینەوە ئەوا بەرنامەکە لێرەدالاناچێت و،هەرلە شوێنی خۆیدا دەبێت.

٩-كليك لەسەر Nextدەكەين :

بڕوانە وێنەی ١٣




١٠-كليك لەسەر دووگمەی nextبكە ،بەم كارەش ئەم پەنجەرەیەی خوارەوە دەكرێتەوە:

*وێنەی ١٤*




١١-كە ئەم پەنجەرەیەی خوارەوەت بۆ دەركەوت ،كەمێك چاوەڕێبە تاپڕدەبێتەوە ولادەچێت.بڕوانە وێنەی ١٥



١٢-لە دووا قۆناغدا کلیك لەسەر دووگمەی Finishبکە:

**وێنەی ١٦**




١٣-ماوەتە لەکۆتایدا کلیك لەسەر okبکەیت لەو سوپاسنامەیەی کەلەکۆتایی و،لەکاتی تەواو بوونی دابەزینەکەدا دێتە بەر دەستت.

**وێنەی ١٧**



## ❖ چۆنیەتی كردنەوەی (چونەناو)بەرنامەكە ..

### o ڕێگەی یەكەم:

**شێوەی یەكەم:**

–ئەگەر بەرنامەكە بەشێوەی بچوكراوەی بڕدراو (shortcut) هەبوو،ئەوا بەدووكلیك لەسەری بەرنامەكە دەكرێتەوە .

ویێنەی ١٨




**شێوەی دووەم:**

كلیكی ڕاست لەسەر شۆرت كەتی بەرنامەی فۆتۆشۆپ بكە ، كە دەكەوێتەسەر ڕووی شاشەكە desktopوپاشان كلیك لە سەر openبكە:

وێنەی ١٩



✓ سەرنجـــــ٤ـــــــ :

بەلآم ئەگەر شۆرت کەتمان shortcutنەبوو لە سەر ڕووی شاشەکە desktopئەوا ناتوانین ڕێگەی یەکەم بەکاربهێنین،وەڵێ درووستکردنی ئەم شۆرتکەتە زۆر ئاسانەو،بەهۆی بەجێگەیاندنی ئەم هەنگاوانەی لای خوارەوە دەتوانین دروستی بکەین،بەم شێوەیە:

١-کلیك لەسەر دووگمەی ستارتStart دەکەین،پاشان سەهمی ماوسەکە دەگوێزینەوە بۆسەر دووگمەی هەموو بەرنامەکانAll programsو،دوواتر سەهمی ماوسەکە دەبەینە سەر بەرنامەی فۆتۆشۆپ سی ئێس و،کلیکی ڕاستی لەسەر دەکەین:

بڕوانە وێنەکە:




٢-سەهمی ماوسەکە دەگوێزینەوە بۆسەر بەشی create shortcutو کلیکی لەسەر دەکەین بەمەش شۆرتکەتێکی بەرنامەی فۆتۆشۆپ لەسەر ڕووی شاشەکە درووست دەبێت و،هەنووکە دەتوانین بەهۆی ڕێگەی یەکەمەوە(شێوەی یەکەم و...دوووەم)بەرنامەکە بکەینەوە:

بڕوانە وێنەکە:



## o ڕێگەی دووەم

کلیکی دووگمەیدەستپێکردنstartدەکەین ،پاشان دەچینەسەر بەشی هەموو بەرنامەکان all programs وکلیکی لەسەر دەکەین فۆتۆشۆپ سی ئێس هەڵدەبژێرین،یان دەتوانین ماوس بەکارنەهێنین بەڵکو پەنجەبنێین بەودوگمەیەی کیبۆردەکەدا کەئارمی ویندۆی لەسەرەو پاشان بەهۆی ئارۆسەکانەوە(سەهمەکان) بچینەسەر ئۆڵ پرۆگرام و دوواتر فۆتۆشۆپ سی ئێس و پاشان ئینتەر بکەین بەمشێوەیە بەرنامەکەمان بۆدەکرێتەوە، یان دەتوانین لەلیستی ستارتدا کلیکی ڕاست بکەین لەسەر بەرنامەکە و،پاشان کلیك لەسەر openدەکەین وەك لەم وێنەیەدا ڕونکراوەتەوە..

وێنەی ٢٠




بەم شێوەیە بەرنامەکە دەکەینەوە ،دووای کەمێك چاوەڕوانی بەرنامەکە بەشێوەیەکی ئەکتیڤ(چالاك) دێتەسەرشاشەو ،وەك هەربەرنامەیەکی دیکەلەچەند بەشێك پێکهاتووە ،کەهەربەشەو گرنگی و،تایبەتمەندی خۆی هەیەو،بەشێوەیەکی وردو ،یەکبەدوایەك باسیان دەکەین و،هیچ شتێك جێناهێڵین بۆ فێرخواز ،بۆئەوەی مێشکی ماند وو نەبێت و،بتوانێت لەڕێگەی ئەم بەرهەمەوە بەشێوەیەکی باش ئاشنای فۆتۆشۆپ ببێت ،کەحەزو خۆزگەی زۆرکەسەو،دونیایەکی خۆش و،پڕجوانکارییە.وەلێ نابێت ئەوەمان لەبیربچێت کەفۆتۆشۆپ و،هەموو بەرنامەکانی جوانکاری پێویستی بەوردی و،بێزارنەبوون هەیە .چونکە لەسەرەتادا هەڵەی زۆر ڕوودەدات.

جیاوازی نێوان دووایین ڤێرژنی فۆتۆشۆپ سی ئێس و ڤێرژنەکانی دیکەی بەئاسانی دەردەکەوێت ئەگەرچی جیاوازی بنەڕەتی ئەوتۆیان لەنێواندانییە.

كەبەرنامەكەمان كردەوە( وەك لەپێشدا باسمانكرد) و،چالاك بوو ،ئەوا لە ناوەڕاستی بەرنامەكەدا پەنجەرەیەك دەبینین كەلەچەند بەشێك پێكهاتووە،لەبەشی سەرەوەیدا هێمایXهەیە كەبۆ داخستنی پەنجەرەكە بەكاردێت ،هەروەها لەتەنیشتی ئەم هێمایەدا ناوی پەنجەرەكەنوسراوە(شاشەی بەخێرهاتن welcome screen) لەدوای ئەمە چەند هێمایەك دەبینین كەبەنزیك كردنەوەی سەهمی ماوسەكە،دەگۆڕێت بۆ دەستێك كەهێمایئەوەیە ئەوهێمایەلینكەو ،بەكلیك كردن لەسەری لینكەكەدەكرێتەوە و،دەتوانین سودیان لێوەربگرین :

وێنەی ٢١




## ❖ پێكهاتەی شاشەی بەخێرهاتن و،سودو ،فەرمانەكانیان:

١-فێربوونی بنچینەی :-دەتوانین سودی لێوەربگرین بۆ فێربوون،بەڵام دەبێت كۆمپیتەرەكەمان ئینتەرنێتی لەسەربێت.

وێنەی ٢٢



٢-و ٣- سودی لێوەردەگیرێت،بەشێوەیەکی بەرچاو.

٤و٦و٧:-بەبوونی بەرنامەی ئەکرۆبات دەتوانین بیکەینەوەو ،سودیلێببینین،کەکۆمەڵێك زانیاری زۆری تیادا دانراوە لەسەر فۆتۆشۆپ ،وبۆ سودوەرگرتن لێی پێویستمان بەهێڵی ئینتەرنێت نییە

وێنەی ٢٣




وێنەی ٢٤




وێنەی ٢٥




٥- تایبەت بەزانیاری گرنگ لەسەر ڕەنگ لەفۆتۆشۆپداو ،ئەم بەشەش بێبوونی هێڵی ئینتەرنێت لەسەر کۆمپیتەرەکەمان سودی تەواوی دەبێت ،بۆئەوکەسانەی شارەزای زمانی ئینگلیزییان هەیە.

وێنەی٢٦



٨-جوڵەی نوێ چییە ...؟؟ئەم بەشە پێویستی بە ماڵپەری ئینتەرنێتی تایبەتی کۆمپانیاهەیەوو ،بێبوونی هێڵی ئینتەرنێت ناتوانین سودی لێوەرگرین .




✓ سەرنجـــــــ٥ ـــــــ

١- لەکۆتای ئەم پەنجەرەیەدا چوارگۆشەیەکی بچوك هەیە ،کەئەگەر کلیکی لەسەربکەین و،سەحی لێبدەین ،ئەوا بەداخستنی ئەو پەنجەرەیە ،پەنجەرەکە دەرناکەوێتەوە لەدوای داخستنی بەرنامەکەوکردنەوەی بۆ جارێکی تر تەنهابەهۆیhelpی menu barوەنەبێت کەدوای باسیدەکەین.

٢- ئەگەر سەح لەچوارگۆشەبچوکەکەنەدەین ،ئەوابەداخستنی پەنجەرەکە گۆڕان لەبوونی بەرنامەکەدا ڕونادات و،بەکردنەوەی جارێکی تری بەرنامەکە پەنجەرەکەدەردەکەوێتەوە .

٣- دوگمەیەك لەنزیك چوارگۆشەبچوکەکەوەهەیە،کەدوگمەی دخستن-ە ،واتەcloseکەوەك هێمای xوایەو هیچ جیاوازییەکی نییە لە کارو چالاکیدا.

**بۆ زیاتر ڕونکردنەوەبڕوانە وێنەکەی سەرەوە**

دوای ئەوەی سودمان لەم بەشەی فۆتۆشۆپ سی ئێس وەرگرت ،کەلە ڤێرژنەکانی پێشتریدانییە ،ئەوا پەنجەرەکە دادەخەین و

،دەڕوانینە بەرنامەکە ،کەسەرەتا دەبینین لەچەند بەشێکی گرنگ (مکونات الشاشە رئیسیە ) پێکاتووە،وەك هەریەك لەبەرنامەکانی تر .

✓ سەرنج ٦:

لە فۆتۆشۆپ سی ئێس دوو دا کەمێك جیاوازی لە شاشەی بەخێرهاتندا هەیەوەك لەوێنەکەدا دیارەو ،چەند بەشێکی لیٚ لابراوەو ،گۆڕانیش بەسەر بەشەکاندا هاتووە:



## ❖ پێکهاتەی بەرنامەکە



# Adobe Photoshop cs &cs2 ئەدۆب فۆتۆشۆپ ٨و٩

١-شریتی ناونیشانtitle barکەپێکهاتووەلەسێ دوگمەی گرنگ کەدەکەونەلای ڕاست و،لەلای چەپیشدا هێما و،ناوی بەرنامەکە نوسراوە،دوگمەکانیش ئەمانەن:-




: ئەم دوگمەیەcloseبەکاردێت بۆ داخستنی بەرنامەکە، وەئەگەر لەوکاتەدا وێنەیەك کرابێتەوە بۆ کارکردن تیایدا ،ئەوابەکلیك کردن لەسەرئەم دوگمەیە پەنجەرەیەکمان دەداتێ ،کەسێ هەڵبژاردنی تیادایەو ،بەهۆیەوە دەتوانین وێنەکە خەزن بکەین،یان نا،یان لەداخستنی بەرنامەکە پاشگەزبینەوە وcancelهەڵبژێرین.

ئەم دوگمەیە کەلەدووبەش پێهاتووە maximizeوrestore downبەکاردێت بۆ بچوك کردنەوەو،گەورەکردنەوەی بەرنامەکە لەسنوری شاشەکەدا و،دەتوانین بڵێین تاڕادەیەك فرمانیان پێچەوانەی یەکترییە.

* : ئەم هێمایەش هەربۆ بچوك کردنەوە بەکاردێت ،بەڵام جیاوازییەکەی لەگەڵ دوگمەکەی پێشودا ئەوەیە ،کە بچوك کردنەوەی لەسنوری ناوەڕاستی شاشەدا نابێت بەڵکو بەرنامە وەك ئایکۆنێك بچوك دەکاتەوەو،لەسەر تاسك بارِدەردەکەوێت،بەم شێوەیە:-




سەرنج:- ئەگەر لەسەرشریتی ناونیشان title barکلیکی ڕاست بکەین ،ئەوالیستێکمان بۆدەردەکەوێت،کەچگەلەوسێ فەرمانەی لەسەرەوە باسکراوە،فەرمانەکانی جولەmoveوقەبارەsizeی تیادایە،کەدەتوانین سودی لێوەربگرین ،هەروەها دەتوانین فەرمانی داخستنcloseیبەرنامەکە بەهۆی کیبۆردەوە ئەنجامبدەین بەبەکارهێنانی کلیلی ئاڵتAlt وئێف چووار(alt+f٤).



٢-شريتى ليستەكان :menu bar-لەم بەشەدا گرنگترين دوگمەى سەرەكى فەرمانەكانى تێدايە ،كەلەدوايدا بەوردى باسيان دەكەين،بڕوانە وێنەكە:-




٣-شريتى ئامڕازى هەڵبژێردراوoption toolbar:-ئەم بەشە بەگوێرەى هەڵبژادن وديارىكردنى يەكێك لەفەرمانەكانى سندوقى ئەدەوات بەديار دەكەوێت،كەوردكردنەوەى چۆنييەتى كاركردنى فەرمانى هەڵبژێردراوى تيادەردەكەوێت،وەك لەپاشدا باسياندەكەم..




٤-سندوقى ئەدەواتtool box:- لەم سند وقەدا فەرمانە گرنگەكانى فۆتۆشۆپ دەردەكەوێت،كەدەشێت بەگەورەترين و،باڵاترين بەش ناوى بێنين كەلەدوايدا يەك يەك باسيان دەكەين،و بەوردى لێيان دەدوێين..



٥-پەنجەرەكانى تەنيشتى(النوافذ الجانبية):- لەم بەشەدا كۆمەڵێك پەنجەرەى تايبەت و،گرنگ هەيە ،وەك زانيارى،و ڕەنگ،وهستری،وهی ديكە،كەهەريەكەيان گرنگى تايبەتى خۆى هەيەو ،يەك يەك باسيان دەكەين.



٦-پەنجەرەی لەوحە(ناوچەی وێنە) :-ئەم بەشەلەكاتی كردنەوەی وێنەدا دەردەكەوێت،كەلەبەشی سەرەوەی دا هەندێك زانیاری دەردەكەوێت ،وەك ناوی لەوحەكەو،ناوی جۆری فایلی خەزنكراو ،واتە gpg یان gif یان psd یان… هەروەها هەرسێ هێمای بچوك كردنەوەو،گەورەكردن و،داخستن دەبینرێت ،كەلەپێشەوە باسمانكردووە،وئەوسێ هێمایە لەهەر پەنجەرەیەك و،لەهەربەرنامەیەكدابێت هەمان فەرمانیان هەیە بێ هیچ جیاوازییەك.




٧-شریتی زانیارییەكان - status bar :-ئەم شریتەوەك لە ناوەكەیەوە دیارە بۆ پیشاندانی هەندێك زانیارییە لەبارەی وێنەی چالاكەوە،كە هاوكات لەم بەشەوە دەتوانین وێنەكە بچوك ،یانگەورە بكەین،هەروەها…




٨-تاسك بار task barلەم بەشەدا دوگمەی ستارت و،چەندین دوگمەو،بەرنامە بەشێوەی بچوك كراوەی هەیە،كەهەریەكەیان سودی تایبەتی هەیەو ،فەرمانی جیاواز بەڕێوەدەبات ،بڕوانە وێنەكە.




سەرنج:لە ڕاستیدا Taskbar بەشێك نییەلەپێكهاتەی شاشەی ڕەئیسیبەرنامەكە.

# ❖ شريتی ليستەكان

## پێكهاتەو فەرمانەكانيان

لێرەدا يەك يەك فەرمانەكانی بەشی menu bar بەشێوەيەكی وردو،زانستی باسدەكەين ،وسەرەتاش لە فايلfileوەدەستپێدەكەين و،هەموو بەشەكانی فايل باس دەكەين پاشان دەچينە سەر بەشەكانی دووای ئەو ..

## ➢ ليستی فايل file



**١–کردنەوەی پەنجەرەی لەوحە (ناوچەی وێنە)** :– کلیکی فایل دەکەین لەمێنیو بارڕدا ،یان پەنجەدەنێین بەدوگمەی ئالْت وپیتی ئێف دا(alt+f) ،و بەم شێوەیە لیستەکەمان بۆدەکرێتەوە ،پاشان دەچینە سەر نویْ newوکلیکی لەسەر دەکەین ،دەبینین پەنجەرەی وێنەمان بۆ دەکرێتەوە (یان دەتوانین لەجیاتی ئەم رێگەیە کورتکراوەیcntrl+oیسەرکیبۆردەکە بەکاربهێنین)کەلەم هەڵبژاردنانە پێکهاتووە:–

*ناوname:–لاکێشەیەکی بچوکەو بۆنوسینی ناوێك تیایدا سودی لێوەردەگیرێت ،کەدەشبێتەناوی ئەو وێنەیەی دەیکەینەوەو،کاری تیادەکەین.

*حەجم وشێوەی ئامادەکراو preset:–لەم سندوقەدا چەند حەجم وشێوەیەك ئامادەکراوە،وەك نامە،و...کەدەتوانین سودیان لێوەرگرین .

*سندوقی حەجمی وێنەکەimage size:–دەتوانین خاڵی پێشتر بەcustomدابنێین و،خۆمان لەم بەشەوە حەجمی وێنەکە دیاری بکەین بەدانانی نرخێك بۆپانی widthو نرخێك بۆ بەرزی highبەپێی پێویستی بەکارهێنەر .

*سندوقی دیقەی وێنەکەresolution:– لەم بەشەی فەرمانی نیودا دیقەی وێنەکەدیاری دەکەین ،کەپەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە حەجمی وێنەکەوە .

سەرنج:–

لەدوو * پێشودا دەتوانین بەخوواستی خۆمان یەکەی بەکارهێنان هەڵبژێرین،جابە سانتیمەتر بێت یان بەئینج یان بەپیکسلْ یان..




*ڕەنگداری mode:–لەم بەشەدا دەتوانین جۆری ڕەنگی وێنەکە هەڵبژێریgrayscale ،یان rgb colorکە بۆمەبەستی تایبەتی بەکاردەهێنرێت،یان cmyk colorکە بۆمەبەستی چاپخانە بەکاردەهێنرێت ،بەشێوەیەکی ملەوەن ،وەهەروەها..

*شێوەو جۆری باکگراوەندی ئەو فایلە نوێیەی دروستی دەکەین background contents:–دەتونین باکگراوەندەکە بەڕەنگی سپی whiteدابنێین ،یان بەشەفافیtransparentیان..

–لەفۆتۆشۆپ سیئیس دابەشی پێشکەوتوو advancedهەیە،کەلەدووبەشی color profileوpixle aspect ratioپێکهاتووەو،بەهۆیەوە دەتوانین جۆرو شێوەی پەنجەرەی لەوحەکە دیاری بکەین،چوارگۆشە بێت،یان لاکێشە ،یان...

لەدوای دیاری کردنی نرخەکان(وەك لەپێشەوە باسکرا) کلیك لەسەر دوگمەی okدەکەین ،یان بەکلیك کردن لەسەر دوگمەیcancelپەنجەرەکە دادەخەین و،لەکارەکەمان پاشگەزدەبینەوە ،هەروەها دەتوانین ئەوحاڵەتەی دیاری مانکردووە(پڕکردنەوەی نیو ،وەك لەسەرەوە باسکرا) خەزن بکەین بۆکاتی دیکەو،وێنەی تر بەکلیك کردن لەسەر دوگمەی save presetکە فۆڕمێکمان دەداتێ تیایدا سەح لەبەشەکانی نیو...modeدەدەین ،بەپێچەوانەوە ئەگەر سەحی لێنەدەین ئەوا سەحلێنەدراوەکە خەزن ناکات .

************

**٢–کردنەوەopen**:– دوای ئەوەی دەچینە سەرفایل fileوکلیکی لەسەر دەکەین ،دەچینە سەر بەشی کردنەوە openبۆکردنەوەی وێنەیەکی،یان فایلێکی خەزنکراو ،دوای ئەوەی کلیکمان لەسەر کرد پەنجەرەیەکمان بۆدەکرێتەوە کەلەم بەشانەی لای خوارەوە پێکهاتووە:–

* look in:–لەو لاکێشە بەتاڵەی کەبەرامبەر ئەم نوسینەیە دەتوانین ئەو بەشەی کۆمپیوتەرەکە هەڵبژێرین کە وێنەکەی تیا پارێزراوەsave.

*ئەو فەرمانەی لەlook inدا جێبەجێدەکرێت ،دەتونین بەهۆی فەرمانەکانی my recent document,desktop,my documents,my computer,mynetworkوەکەدەکەوێتە لای چەپی پەنجەرەکەوە (وەك لەوێنەکەدادیارە) جێبەجێبکەین.

*file name:–بەکلیك کردن لەسەر هەروێنەیەك بۆئەوەی بیکەینەوە ،ناوەکەی لەم بەشەدا دەنوسرێت ،واتەئەوناوەدەنوسرێت کە وێنەکەی بەناوەوەخەزنکراوە.

*file of type:– لێرەدا جۆری فایلەکە (وێنەکە) دیاری دەکەین ،کەئایا تەنها ئەو وێنانەمان نیشان بدات کەبە gifخەزنکراون یان ...،یان all fileبۆئەوەی هەموفایلەکانمان پیشانبدات.

* file size:– بەکلیکردن لەسەروێنەکە لێرەدا حەجمی وێنەکەمان بۆدەنوسێت و،وێنەکەشمان پیشاندەدات.

دوای دیاری کردنی وێنەکە بەکلیککردن لەسەری ،کلیکی دوگمەی openدەکەین ،یاخود دەتوانین دەبلّ(دووانە) کلیك لەسەر ئەو وێنەیە بکەین کەدەمانەوێت بیکەینەوەو،یەکسەر وێنەکەمان بۆ دەکرێتەوە،واتەهەنگاوێکی کورتکراوەیە.

هەروەها بەکلیکی cancelلە فەرمانی کردنەوەکە پەشیمان دەبینەوە.

وێنەی کردنەوەی فایل

Open




**********************

٣-**browse**:- ئەم بەشە بەكاردەهێنرێت بۆكردنەوەی وێنە وەكو open بەڵام لەوەدا جیاوازە كە لێرەوە دەتوانین ناوی فایلەكان بگۆڕین،یان سەلێكتیان بكەین،یان... كەلەبەر گرنگ نەبوونی زۆربەپێویستی نازانم زۆری لەسەر بدوێم،وەڵێ گرنگترینیان بەشێوەیەكی سادەو،كورتكراوەی باسدەكەم..بەم شێوەیە:-

١-دروستكردنی فوڵدەری نوێ:

File>new folder

٢-كردنەوەی ئەو وێنەیەی دەمانەوێت:

File>open

دەبێت پێشتروێنەكەمان سەلێكت كردبێت،هەروەها دەتوانین بەدەبڵ كلیكیش بیكەینەوە.

٣-ناردنی وێنەكە بۆ ئیمەیج رێدی بۆدەستكاری كردن:-

File>edit in image ready

٤-داخستنی پەنجەرەی گەڕان:

File>close file browser

٥-زانیاری لەسەروێنەی هەڵبژێرداو(سەلێكت كراو):

File>file info…


شریتی لیستەکان
هەڵبژاردنی شوێنی وێنەکە
هەڵبژاردنی شێوەی پیشاندان
File Edit Automate Sort View
Folders
nanse
Show: Flagged and Unflagged
My Pictures
My Videos
SWISHpixWorkspace
Unzipped
My Network Places
ناوچەی فوڵدەرە و... پێکهاتەکان
Preview
ناوچەی پیشاندان
035_39
035_40
035_60
035_51
035_55
035_58
ناوچەی وێنەی بچوك
Metadata
Keywords
Assigned Keywords:
ناوچەی زانیارییە معیارییەکان
Event
Birthday
Graduation
19 Item(s)
کلیلی وشەکان
دووگمەی گۆڕینی شێوەی بینینی وێنەکان
بۆ گەورەکردن و...بچوككردنەوەی پەنجەرەکە

٦-سرینەوەی وێنەی سەلێکت کراو:

File>delete

٧-دانان و ،لابردنی فولْدەر بۆبەشی هیوایەت و،بەپێچەوانەشەوە:

File>add to favorite

File>remove folder from favorite

٨-گەڕان:

File>search…

بەهۆی ئەم بەشەوە دەتوانین بەدوای وێنەیەکی پێویستدا بگەڕێین بەهۆی زانینی ناوەکەی،یان قەبارەکەی،یان جۆری خەزنەکەی،یان....،وەدیاری کردنی ئەوبەشەی کەتیایدادەگەڕێت.

٩-سەلێکتی هەموو وێنەکان ،وەپەشیمان بونەوەلە سەلێکتەکەولابردنی:

Edit>select all

Edit>deselect all

١٠-دانانی هێمای ئالاْ بۆ وێنەی هەلْبژێردراو،کەبۆ گەڕان searchسودیدەبێت:

Edit>flag

١١-سوڕاندنی وێنە بەگۆشەی جیاواز:

Edit>rotate١٨٠ or ٩٠cw or ٩٠ccw or apply rotation

١٢-گۆڕینی وێنەبۆ PDF:

Automate>PDF presentation..

١٣-دروستکردنی ئەلبومی وێنەیی بۆ ئینتەر نێت:

Automate>web photo gallery

١٤-لەگەلْ چەند فەرمان و،گۆڕانی دیکە کەلەبەر پێویست نەبونیان باسی ناکەین ،وبەکاربەر خۆی فێریان دەبێت.

سەرنج:-بەشی براوسەرbrowserجگەلەوەی لەڕێگەی فایلەوە دەکرێتەوە دەتوانین بەهۆی windows>browserوەیانshift+cntrl+oوەبیکەینەوە.

٤- open as:- کردنەوە لەناو -وەك فەرمانی کردنەوەopenوایە بێهیچ جیاوازییەکی بنەڕەتی .



**********

## ٥-..open recent:کردنەوەی ئەووێنانەی پێشتر بەکارمانهێناوە.




**********

## ٦-edit in image ready:گواستنەوەی وێنەکەبۆ بەرنامەی یارمەتی دەری فۆتۆشۆپ بۆ دەستکاری کردنی تیایدا.



*********

**٧-داخستنی وێنەی کراوەclose**:بەکلیك کردن لەسەری ئەو وێنەیەی چالاکەو لەسەر شاشەکەیە دادەخرێتەوە.

*********

٨-داخستنی کۆمەڵێك وێنەی کراوەبەهۆی کلیك کردنی **close all**-وە دەبێت.

**********

**٩-هەڵگرتنی وێنەبەهۆیsave**-ەوە دەبێت،کەتیایدا شوێنی خەزن و،ناو،وجۆری خەزن و...دیاری دەکەین.

*********

**١٠-پاراستن وەکوsave as**:بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین وێنەکەی بەردەستمان جارێکی تروبەناو پاشگری تازەوە لەشوێنێکی تازەدا خەزن بکەین.

********

**١١-خەزنکردن بۆ وێبsave for web**:بەهۆی ئەم بەشەوە دەتوانین وێنە خەزنبکەین و ئامادەی بکەین بۆماڵپەری ئینتەرنێت.



*********

**١٢–دانانplace:** دەتوانین سود لەم بەشە وەربگرین بۆ دانانی فایلێك لەسەر وێنەیەکی دیاری کراو ،کەزۆر سودی هەیەو،کارئاسانی یەکی باشە،بەنمونە ئەگەر شیعرێکمان هەبێت وبەPDFخەزنمانکردبێت بمانەوێت بیخەینەسەروێنەیەك ئەوا پێویستەلەپێشداوێنەکەبکەینەوە،پاشان کلیك لەسەر فەرمانیplaceبکەین و،ئەو شیعرەی دەمانەوێت بیخەینەسەروێنەکە بەکلیکێك دیاری‌دەکەین پاشان کلیکی دوگمەی placeدەکەین ،یان یەکسەر دەبلّ کلیکی بابەتەکەدەکەین ئەوادەبینین هاتۆتەسەر ئەو وێنەیەی کەپێشتر کردوومانەتەوە،وەدەتوانین لەسەر وێنەکەدەستکاری بکەین شوێنەکەی‌بگۆڕین،یا گەورەی بکەین،یان پاشگەزبببینەوەولایبەرین ئەویش بەکلیك کردنی دوگمەی deleteسەرکیبۆردەکە،یان بەهۆی پەنجەنان بەf١٢دا،واتەفەرمانی invertلەلیستیfileدا،کەزۆرجار دوای دەستکاری بابەتەplaceکراوەو،دەبلّکلیك کردن لەسەری ئەم فەرمانە چالاك دەبێت،واتە بەلابردنی چوارلای بەخالّدیاری کراوی دەستکاری کردن...لەبەرئەوەی پەنجەرەیplaceوەکو پەنجەرەی openوایە بەپێویستی نازانم وێنەکەی دابنێم ،بەلاّم دانانی ئەم شێعرەی نووسەر لەسەروێنەی کیژێکی جوان وەك ڕونکردنەوەی‌زیاتر دەخەینەبەرچاوتان.



*********

**import–١٣:**ئەم بەشە دوو بەکارهێنانی زۆرگرنگی تێدایە ئەوانیش،یەکەمیان کردنەوەی وێنەیەکەبەشێوەیPDFخەزنکرابێت لەسەرەتادا ،وەدووەمیان زۆر لەیەکەم گرنگترە ئەویش هێنانی وێنەیە بۆ دەستکاری کردن و،بەئەنجام گەیاندنی کاری پێویست،کە فەرمانی سەرەکی بەرنامەی فۆتۆشۆپە،بەم شێوەیە:

file>import>PDF image*

File>import>Mira scan v٤*

✓ **سەرنجـــــــــ٧ـــــــــــ**

**PDF Imageلە فۆتۆشۆپ سی ئێس دوو دا (واتە فۆتۆشۆپی ٩)گۆڕاوەبە** (variable data set….)**بەڵام لە ڤێرژنی هەشتدا بوونی هەیەو ،کارێکی باشیشی هەیە.**

*********

export–١٤:ئەم فەرمانەلە کاتێکدا چالاك دەبێت،کەوێنەیەك کرابێتەوە بۆ کارکردن تیایدا،وەبەپێچەوانەوە چالاك نابێت ،وەسودی ئەم فەرمانە بەشێوەیەکی سەرەکی خەزنکردنی وێنەیەبەشێوەی adobe illustratorو،هەروەها پیشاندانی شاشەیzoom viewکەهەریەکەیان گرنگی تایبەتی خۆی هەیە.

*********

**automate –١٥** هەمان فەرمان لەفەرمانەکانی browserدا باسکراوەو،تەنها جیاوازییەکی کەمی هەیەوەك فەرمانی٢contact sheetکەبەهۆیەوە دەتوانین چەندوێنەیەکی فوڵدەرێك لەیەك پەیجدا دابنێین بەشێوەیەکی خۆیautoکەئەمەش گرنگی خۆی هەیەو،دەتوانین بەم شێوەیە کاری تیادابکەین.

دوای ئەوەی چوینەسەر fileوکلیکمانکرد ،پاشان دەچینەسەر automateولەمیشدا کلیك لەسەرcontact sheetدەکەین وهەڵیدەبژێرین،کەبەکلیککردنی پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوەکەلە کۆمەڵەهەڵبژاردنێك پێکهاتووەو،دەیانکەین بەسێ بەشەوەو،لەپێکهاتەی هەربەشێکیان دەدوێین:

a-سەرچاوەی وێنەکەsours image:کەپێهاتووەلە:

١–use:واتە ئەو وێنانەی دەمانەوێت بەکاری بهێنین ئایا folder–ە ،یان وێنەیەکی هەڵبژێردراو(سەلێکتکراو)ی ناو browserکەبەخواستی خۆمان و ،بەگوێرەی پێویست یەکیان هەڵدەبژێرین.

٢–بەشی browserکەبەهۆیەوە شوێنی وێنە پێویستەکە دیاری دەکەین ئەگەر folderبوو.

٣-بەشیinclude all subfolderکەبە کلیك کردن لەسەر چوار گۆشەکەی بەردەمی هەموو ئەو فۆڵدرانەشمان بۆدەکات ،کەلەناو فولدەرە سەرەکی یەکەدایە،کەدەمانەوێت کاری تیا بکەین.

B-بەشیdocomentکەپێکهاتووەلە:-

*یەکەی پێوانەی وێنەکەunitبە سم بێت ،یان پیکسڵ،یان...

*پانی وێنە.width

*بەرزی وێنەheight.

*دیقەی وێنەresolution.

*ڕەنگی وێنەکانmode.

*ئەگەر ویستت هەموو چینەکان تەخت بێت ئەوا کلیکی چوار گۆشەی بەردەم flatten all layerبکە.

c-بەشی thumbnailsلە بەشەدا دەتوانین چۆنی یەتی ڕیزبوونی وێنەکان دیاری بکەین،بەم شێوەیە:

*بەهەڵبژاردنی first acrossیplaceوێنەکان بەشێوەی لار و ئاسۆییانە ڕیزدەکات،وەبەهەڵبژاردنی down firstوێنەکان بۆخوارەوەبەشاوڵی دادەنێت.

*دەتوانین ڕیزکردنی وێنەکان دیاری بکەین کەئایا بەچەند عەموودcolumnوچەند ڕیزی ئاسۆی rowبۆماندابنێت.

*دەتونین کلیکی چوارگۆشەی بەردەم use auto spaceبکەین تابەشێوەیەکی خۆیی بۆشای نێوان وێنەکانمان بۆ دیاری بکات ،یان دەتوانین سەحی لێنەدەین و،خۆمان بۆشای نێوان ڕیزە ئاسۆییەکانverticalی نێوان وێنەکان،یان بۆشای ستونی نێوان وێنەکان horizontalدیاری



بکەین بەنوسینی بڕی ژمارەی پێویست لەچوارگۆشەکەی بەردەمیاندا بەگوێرەی پێویستی کارەکەمان.

*بەکلیککردن لە چوارگۆشەیrotate for best fitوێنەکان بەباشترین شێوە جوت دەبن لەگەڵیەکدا.

d–بەشی کۆتایuse filename captionئیختیارییەو دەتوانین بەکاری نەهێنین.

*************

١٦–script:–بەشێکی زۆرگرنگ نی یەو،زۆر پێویستمان نابێت بۆیە باسی ناکەین.

*******

١٧–بەشی زانیاری فایلیش..file infoبەهەمانشێوەی بەشی پێشوو زۆرجێگەی بایەخ نی یە.

*******

١٨–ڕێکخستنی پەڕەpage setup:بەکار دەهێنرێت بۆ دیاریکردنی جۆری ئەو پەڕەیەی دەمانەوێت وێنەکەی لەسەر چاپبکەین ،واتەنامەبێت ،یانA٤و،یان...،هەروەها دەتوانین شێوەکەشی دیاری بکەین کەئایا ئاسۆیLANDSCAPEبێت،یان ستونیPORTRATEوەدەتونین ئەوحەجمەی هەڵیدەبژێرین یەکسەر پرێنتیشی بکەین.

بڕوانە وێنەکە



**١٩-چاپ کردن لەگەڵ پیشاندانprint with preview**:بەهۆی ئەم بەشەوە دەتوانین هەمان فەرمانی پێشوی خاڵی١٨ی ڕێکخستنی پەڕەش ئەنجامبدەین لەگەڵ دیاری کردنی حاشیەی سەرەوەtopولای چەپ leftوscaleوبەرزیheightوپانیwidthوەبەکلیك کردن لەناو چوارگۆشەی بەردەمshow bounding boxوێنەکەلەبەشی پیشاندانادەگۆڕێت بۆ شێوەیەك کەبەهۆی چوارگۆشە بچوکەکانی چواردەوریەوە دەتوانین گەورە یان بچوکی بکەینەوە،وەك چۆن لەبەرنامەی وۆرد دا ئەنجامی دەدەین کاتێك وێنەکەمان لە فرۆم فایلەوە هێنابێت،واتەلەئینسێرت،پێکەوە.وەبەکلیك کردنی چوارگۆشەی بەردەمshow more option هەڵبژاردنی زیاترمان دەداتێ کەدەتوانین سودی لێوەرگرین.

*********

**٢٠-چاپکردنprint**:بەکلیك کردن لەسەر ئەم بەشە دەتوانین ئەو وێنەیەی هەمانە چاپی بکەین کەپێك هاتووە لەچەند بەشێك:

*nameناوی پرنتەرەکەی تیادا هەڵدەبژێرین.

*print to file:چاپکردن بۆ فایل ،بە کلیك کردن لە چوار گۆشەکەی بەردەمیدا هەڵیدەبژێرین و،بەمەش نیشانەیەکی ڕاست دروست دەبێت و،فەرمانەکەچالاك دەبێت.

*number of copies:بە هۆیەوە دەتوانین ژمارەی کۆپی کردنی ئەووێنەیە،یان وێنانەی دەمانەوێت دیاری بکەین.

*بەهۆی فەرمانیproperties-ەوە،دەتوانین هەڵبژاردنی تر ئەنجامبدەین،وەك دیاری کردنی حەجمی پەڕەکەA٤بێت،یان نامەو...هەروەها شێوەو جۆری پەڕەکەئایاشاوڵیverticalبێت،یان ئاسۆیhorizontalوەهەروەها هەڵبژاردن و،گۆڕانکاری دیکەش.



**************

٢١-print one copy:ئەم فەرمانە بەكار دەهێنرێت ،بۆ كۆپی كردنی یەك دانە لەوێنەی خوازراوی پێویست.

**************

٢٢-exit:ئەم فەرمانە بەكار دەهێنرێت بۆ داخستنی بەرنامەكە،كەبە control+Qیانalt+F٤یش ئەنجامدەدرێت.




كتێبی :(لاو ،و ژیانی سێكسی) یەكێكە لەبەرهەمەكانی نووسەر كەئامادەیە بۆ چاپ و...لەچەند وتارو ،لێكۆڵینەوەی پزیشكی وكۆمەڵایەتی پێكهاتووە لەسەر ژیانی سێكسی لاو...كە پێشتر لەرۆژنامەو، گۆڤارو،سایتەكاندا بلاَوكراونەتەوە...چاوەرێبن

# ➢ ليستى edit


Edit Image Layer Select Filter View Win
Undo Rectangular Marquee Ctrl+Z
Step Forward Shift+Ctrl+Z
Step Backward Alt+Ctrl+Z
Fade... Shift+Ctrl+F
Cut Ctrl+X
Copy Ctrl+C
Copy Merged Shift+Ctrl+C
Paste Ctrl+V
Paste Into Shift+Ctrl+V
Clear
Check Spelling...
Find and Replace Text...
Fill... Shift+F5
Stroke...
Free Transform Ctrl+T
Transform
Define Brush Preset...
Define Pattern...
Define Custom Shape...
Purge
Color Settings... Shift+Ctrl+K
Keyboard Shortcuts... Alt+Shift+Ctrl+K
Preset Manager...
Preferences

لیستی editیش وەك لیستی پێشو لەچەند فەرمانێكی جیاواز پێك هاتووە،كەبەپێویستی دەزانم یەك یەك بەوردی باسیان بكەم:

۱–undo:واتە پاشگەزبونەوە لەهەنگاوێك،بۆنمونە ئەگەر بەشێكی وێنەیەك ببڕین cut،ئەوا دەتوانین بەكلیك كردن لەسەر ئەم دووگمەیە پاشگەز ببینەوەلەو كارەی كردوومانە.

***********

۲–step forward:واتە هەنگاوێك بۆ پێشەوەبەنمونە ئەگەر چینی باكگراوەندی نوسینێك بگۆڕین بەرەنگێك،یان ستایڵێك پاشان پاشگەزundoببینەوە،ئەوابەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین بچینەوە هەنگاوی پێشو.

************

۳–step backward:هەنگاوێك بەرەو دواوە ،دەتوانیت نمونەكەی پێشو پێچەوانە بكەیتەوە.

✓ سەرنجـــــــ۸ـــــــ: زۆربەی فەرمانەكان لەكاتی پراكتیكی(عملی)دا دەردەكەون و،ڕوندەبنەوەبەشێوەیەكی زیاتر.

**************

٤–cut:بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین بەشێكی هەڵبژێراو(سەلێكت كراو)ببڕین بەمەش لەشوێنەكەی خۆیدا نامێنێت و،دەقرتێت.

***************

۵–copy:جیاوازییەكەی لەگەڵ فەرمانی پێشودا ئەوەیە كە ئەو بەشەی سەلێكتمان كردووە لەجێگەی خۆی دەمێنێتەوەو،نوسخەیەكی هاوشێوەی سەلێكت كراوەكەمان بۆ دروست دەكات.

************

٦-**copy merged**:وەك هەمان فەرمانی کۆپی بۆمەبەستی لەبەرگرتنەوەی نوسخەیەك لە نوسخەیەکی دی بەکاردێت.

************

٧-**paste**:فەرمانی دانان لەکاتێکدا چالاك(ئەکتیڤ) دەبێت ،کەپێشتر یەکێك لەفەرمانەکانی cutیانcopyیان copy mergedمان ئەنجامدابێت،وەئەگەرنا بەپێچەوانەوەناتوانین کاری پێبکەین.

***************

٨-**past into**:فەرمانی دانان لەناو بەهەمان شێوە ی فەرمانی پێشوpasteکاردەکات.

***************

٩-**clear**:واتە سڕینەوە ،کەهەڵدەستێت بەسڕینەوەو ،لابردنی شتێکی سەلێکت کراو ،بەنمونە لابردن وسڕینەوەی بەشێکی سەلێتکراوی نوسینێك کەپاشان لەفەرمانی textدا زیاتر ڕونی دەکەینەوە بەنمونەوە بۆ زیاتر تێگەیشتن.

١٠-..**check spelling**:ئەم فەرمانە سودی لێوەردەگیرێت بۆ چاك کردنی هەڵەی ڕێنوسی یان ڕێزمانی ،بەنمونە ئەگەر بمانەوێت بنوسین هەموو ساڵێك بەخۆشی ،وبەهەڵە بنووسینhappi neo yeorئەوا بەکلیك کردن لەسەرئەم بەشە وشەهەڵەکانمان بۆ ڕاستدەکاتەوە بەپیشاندانی ئەو وشانەی نزیکە لەو وشەیەیی کە نوسیومانەو هەڵەیەو یەك یەك ڕاستیان دەکەینەوە بەهەڵبژاردنی وشەڕاستەکان بەم شێوەیە:

Edit>check spelling...

پاشان پەنجەرەیەکمان بۆدەکاتەوە کەلەبەشی یەکەمnot in dictionary-یدا بۆمان دەنوسێت،واتە ئەو وشەیە کەوشەی یەکەمی نوسینەهەڵەکەمانە لە فەرهەنگەکە(قاموس)دا نی یەو،لەبەشی دووەمدا پێماندەڵێت بیگۆڕە بۆchange toکەلەبەشی suggestionداوشەکان دیاری دەکات کەپێویستە بیگۆڕین بۆی.

بەم شێوەیە یەکەیەکەی وشەکان چاك دەکەین کەهەڵەن بەهۆی کلیك کردن لەسەر وشە ڕاستەکەلەبەشی suggestionدا پاشان کلیکی وشەی changeدەکەین کەیەکسەر ئەو وشەیەمان بۆ چاکدەکات و،دایەلۆگ بۆکسەکەلا دەچێت ،وەبەکلیك کردن لەسەر فەرمانی change allئەو

وشەیەی هەڵمانبژاردووە،کلیکمان لەسەرکردووە لەبەشیsuggestionدا بۆمان دەگۆڕێت و،چاکی دەکات بێئەوەی دایەلۆگ بۆکسەکە لابچێت،کەدەتوانین بەهۆیەوە دانەدانەی وشە هەڵەکان چاکبکەین.




✓ سەرنجـــــــــــــ٩ـــــ:دەتوانین بەزوبانی عارەبی –ش هەڵە چاکبکەین.

*****************

١١–find and replace txt...:ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی دەقێك کەلەبەشی find what..–دا دەینوسین، بۆئەوەی بۆمان بگۆڕێت بە نوسراوێکی دیکە، کەلەبەشی change to..–دا دەینوسین، هەتاوەکو کاری گۆڕانەکەمان بۆ ئەنجامبدات،پاشان کلیك لەسەر فەرمانی find text..دەکەین کەهەڵدەستێت بەدۆزینەوەی ئەو نوسینەی داوامان کردووەبۆمان بگۆڕێت و،بەرەنگی ڕەش بۆمان دەستنیشان دەکات،لەکۆتاییدا کلیك لەسەر change..دەکەین هەتاوەکو بۆمانبگۆڕێت،یان کلیکی change allیانfind\changeدەکەین کەلەیەك کاتدا بۆماندەدۆزێتەوەو،بۆشمان دەگۆڕێت،بەنمونە بۆزیاتر ڕوونکردنەوە ئەوگۆرانی یە ئینگلیزیەوەردەگرین و،پاشان بەشێکی دەگۆڕین.









١٢-fill:بە كليك كردنى ئەم فرمانە دەتوانين هەنديك گۆڕانكارى گرنگ ئەنجامبدەين،بەنموونە ئەگەر نووسينێكمان هەبێت كەلەدووبەش پێكهاتبێت ،بەشێكيان باكگراوەند بێت و،بەشەكەى ديكەيان نووسينەكە،ئەوا بەكليك كردنى ئەم فەرمانەبەشى..fillلەپەنجەرەى تەنيشتيدا درووست دەبێت،كەدەتوانين بە كليكى ڕاست لەسەركردنى ئەم گۆڕانانەئەنجامبدەين:




*كردنەوەى ...new snapshotكەبەسىَ شێوە دەتوانين كار تيادابكەين:

-دواى ئەوەيى كليكمان لەسەر كرد پەنجەرەيەكى بچوكمان بۆ دەكرێتەوە،كەلەبەشى ناوnameدا ناوێكى بۆ دەنوسين،وەلەبەشى fromدا يەكەم جار full documentهەڵدەبژێرين، دەبينين وێنەى سەر شاشەكەمان بەتەواوى بۆ دادەنێت لەناو پەنجەرەى تەنيشتيدا لەژێر وێنەبنچينەييەكەوە وەك خۆى.

–وەك خاڵی پێشوو ،بەڵام ئەمجارەیان merged layer هەڵدەبژێرین کەوێنە بنچینەیەکەمان بۆدەکاتە یەك چین و،هەموو چینەکان لەوچینەدا کۆدەکاتەوە،وئەگەر بمانەوێت بیجوڵێنین ئەوا هەمووچینەکان پێکەوەدەجولێن ،بەڵام لەخاڵی پێشودا وانی یە.

–ئەمجارەشیان بەهەمان شێوە،وەلێ current layer هەڵدەبژێرین ،کەتەنها باکگراوەندەکەمان بۆدەکات لەم بارەدا.

*سڕینەوەی delete snapshot:بەکلیکی new snapshot راست کردن پاشان کلیك کردن لەسەر deleteکەبەم کارە پەنجەرەیەکی بچوکمان بۆدەکاتەوەوپێماندەڵێت delete snapshotوەلەبەینی کەوانەیەکا دیاریدەکات کەسناپشۆتی چەنەمەو،بەکلیك کردن لەسەر yesدەیسڕێتەوە وەبەپێچەوانەشەوە.

*پاك کردنەوەی پێشینەی history بەکلیك:clear کردن لەسەر ئەم بەشە پەنجەرەی هیسترییەکەمان بۆ پاکدەکاتەوە.

*دۆکیۆمێنتی نوێ new documentبەکلیك کردن لەسەر ئەم بەشە دۆکۆمێنتێکی نوێمان بۆدەکاتەوە بەهەمانشێوەی دۆکیۆمێنتەکەی پێشوو.

***************

**١٣–..stroke:**ئەم فەرمانە وەك زۆرێك لەفەرمانەکانی تر بەبونی فەرمانی تر چالاك دەبێت،بەنموونە ئەگەر فایلێکی نوێ بکەینەوەو،بازنەیەك،یان چوارگۆشەیەك،یان ...تیاسەلێکت بکەین،ئەوا دەتوانین بەهۆی ئەم فەرمانەوە بەشە سەلێکت کراوەکە لەسەر فایلەکەوێنەبکێشین بەدیاری کردنی پانی widthوەرەنگەکەی colorوەشوێنەکەی locationکەسێ شێوەیە:

١–لەناو inside

٢–لەچەقدا center

٣–لەدەرەوە outside






وەهەروەها دیاری کردنی شێوەی ڕەنگەکەی کەئایاتاریکdarkenبێت ،یان ئاسای normalیان ڕوناکیەکی نەرموناسکlight softیان ڕەق light hardبێت وەهەروەها دیاریکردنی opacityبەڕێژەی ١٠٠٪.

********************

**١٤-free transform**:ئەم فەرمانە بەکار دەهێنرێت بۆدەستگرتن بەسەرگەورەکردن و،بچوك کردنەوەی بەشێکی سەلێت کراو لەوێنەیەك،یان لەکاتی دروستکردنی بازنەیەك،یان چوارگۆشەولاکێشەیەك،یان...بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین گۆڕان لەحەجمەکەیدابکەین بەهۆی ئەوچوارگۆشەبچوکانەی لەهەرچوار تەنیشتی بەشەکەدا دروست دەبێت،وەك لەم نمونەیەدا دیارە:







ئەگەر بمانەوێت بەشی دیاری کراوی ئەو وێنەیە وەربگرین و،گەورەی بکەین،ئەوا لەپێشدا ئەو بەشەی دەمانەوێت سەلێکتی دەکەین پاشان دەچینە سەرeditوکلیکی free transformدەکەین،کەبەهۆیەوە وێنەکەمان بۆدەستنیشان دەکات کەبەهۆیەوە دەتوانین گەورە یان بچوکی بکەینەوە وبیگوێزینەوە بۆ فایلێکی نوێ وچ گۆڕانێکمان ویست تیا ئەنجامبدەین.

باشتر وایە بەرلە ئەنجامدانی ئەم فەرمانە وێنەکەسەلێت بکەین و،بەهۆی cntrlوڕاکێشانی یەوە،یان بەکۆپی وپەیست بگوێزینەوە بۆسەر فایلێکی نوێ پاشان گۆڕانکاری تیائەنجامبدەین.هەروەها بەکلیکی ڕاستکردن لەسەروێنەکە دووایی کلیك کردن لەسەر فەرمانیtransform freeدەتوانین گۆڕانکاری ئەنجامبدەین وەك سوڕانەوەیrotateوێنەکەبەچەند شێوەیەك وەك خولانەوەبەگۆشەی ١٨٠پلە بۆخوارەوە١٨٠rotateیان بە٩٠پلە بەلای چەپداrotate٩٠ccwوەسوڕانەوەی بەگۆشەی٩٠بەلای ڕاستداcw ٩٠ rotateوەئەنجامدانی فەرمانی سوڕانی وێنەکە بەشێوەی ئاسۆی flip horizontalوەبەشێوەی ستونی flip

# Adobe Photoshop cs &cs2 ئەدۆب فۆتۆشۆپ ٧و٨

verticalکە وێنەکە سەربەرەو خواردەکاتەوە،وەئەم فەرمانانە بەدووبارە کلیك کردنەوەیان بۆجاری دووەم فەرمانەکەپێچەوانەدەکاتەوە.

**١٥-transform**:ئەم بەشە پێکهاتووە لەچەند فەرمانێکی گرنگ کەبەپێویستی دەزانم بەوردی یەکەیەکە باسیان بکەم ،ئەگەرچی دووبارەی فەرمانی پێشوو(١٤)دەبێت لەهەندێك شوێنداو ،لەوشووێنانەدا ئاماژە بەپێش خۆی (فەرمانی ١٤)دەدەین بۆئەوەی دووبارەنەبێتەوە:

***again**:دووای ئەوەی وێنەکەمان سەلێکتکرد ئەگەر کلیك لەسەر ئەم فەرمانەبکەین ،ئەوابەشەسەلێکت کراوەکەمان بۆ دەبڕێت و،جیای دەکاتەوەلەوێنەکەو،ئاوەژووی لاکانیش دەکات ،واتە ڕاست دەکاتەچەپ و،بەپێچەوانەوە چەپیش دەکاتەڕاست.

***scale**:بەکلیك کردنی ئەم فەرمانە وێنەکە دیاری دەکات بەچەند چوارگۆشەیەکی بچوك کە دەتوانین بەهۆیەوە بەشەسەلێکتکراوەکەی پێش ئەم فەرمانە سەلێکتمان کردووە گەورە ،یان بچوکی بکەینەوە،ئەم فەرمانە بۆ گەورەکردن و بچوك کردنەوەی لەیەرێکی(چینێکی) دیاری کراویش بەکاردێت بیٚ هیچ جیاوازییەك.

***rotate**:بەکلیك کردنی ئەم بەشە بەهەمان شێوەی فەرمانەکەی پێشوو دەتوانین بەهۆی درووستبوونی چوارگۆشە بچوکە کانی تەنیشتی یەوە،بەدانانی خاڵٚ ماوسەکە لایانەوە وێنەکە بەخواستی خۆمان بسوڕێنینەوە.

***skew**:ئەم فەرمانە وێنەکە چالاك دەکات تابتوانین بەیەکێك لەلاکانیدا بیگۆڕین بەجێگیری لاکەی تر ،جاگۆڕانەکە گەورەکردن بێت،یان سورانەوە،یان گوێزانەوەی ئەولایە بێئەوەی لاکەی تری بگۆڕێت(ئەم بەشە فێرخواز زیاتر لەکاتی پراکتیکیدا بۆی ڕووندەبێتەوە)

***distort** :ئەم فەرمانە هەمان فەرمانی پێشوتر ئەنجامدەدات.

***perspective**:ئەم فەرمانەش وەك فەرمانەکانی پێشووکاردەکات ،بەڵام لێرەداناتوانین بەتەواوی سەیتەرە بەسەروێنەکەدابکەین و،وێنەکەئاوەژووبکەینەوە،یان بەهەموو ئاڕاستەکاندا بیجوڵێنین و،بیخولێنینەوە.

***خولانەوەبەگۆشەی دیاریکراو:لەخاڵی ١٤داباسکراوە.**

***flip verticalوflip horizontal**:لەخاڵی ١٤-دا باسکراوە.



١٦- **define brush present**:پێناسەی برەش کەبەشێوەی ڕەش و سپی دەبێت و،خۆی ژمارەیەکی بۆ دادەنێت و،دەبێتەشوێن حەجمی برەش،کەدەتوانین لەبەشی ٢٠-وە ببینین.

**************

١٧- **define pattern**:پێناسی پاتێرن کەوەك خۆی دەیکات و،دەبێتەبەشێك لە پاتێرنسpatternsوەك لەخاڵی ١٩-دا دەیبینن.

******************

١٨- **color setting**:ڕیکخستی ڕەنگی لێوە ئەنجامدەدرێت.




**********************

١٩- **keyboard shortcuts**:دەتوانین سود لەم فەرمانە وەربگرین بۆ زانینی هەموو کورتکراوەکانی فەرمانەکان کەبەشێوەی شۆرت کەتshort cutsهەیەو دەتوانین بەکیبۆرد ئەنجامی بدەین هەم بۆ کارئاسانی و،هەم بۆ کات گێرانەوە،لەم فەرمانەوە دەتوانین بەش بەش کورتکراوەکان ببینین یان هەموو پێکەوە ،بۆئەوەی هەموو پێکەوە ببینیت دووای ئەوەی کلیکت لەسەر ئەم فەرمانە کردو پەنجەرەی فەرمانەکەت بۆ کرایەوە ،کلیك لەسەر ..,summarizeبکەو شوێنی کردارەکە لەsave in-دا هەڵبژێرەوە ،پاشان لە file name-دا ناوێکی لێبنێ و،لەکۆتایدا کلیك

لەسەر save–بکە ،ئەوا هەموو کورتکراوەکانمان لە پەڕەی وێب دا بۆ خەزن دەکات و،یەکسەریش نیشانمان دەدات و،دەتوانین سود مەند بین لێی.

**٢٠–present manager**:دەتوانین سودی لێوەر بگرین بۆ فێربوونی کورتکراوەکان،کەهەرفەرمانەو کورتکراوەکەی بەرامبەر نووسراوە،وەهەروەها فەرمانەکانی وەك ستایل و، gradient،swatchesو....هتد ،تیادایە کەبەدەبڵ کلیك کردن لەسەر هەربەشێکیان پەنجەرەیەکمان دەداتێ کەدەتوانین بەهۆیەوە ناوەکەی بگۆڕین وە،لەبەشی **preset type**–یەوە ئەو بەشەی دەمانەوێت هەڵی دەبژێرین وەهەروەها دەتوانین بەهۆی**done**–وە جێبەجێی بکەین،یان ..save setسەیڤی بکەین بەهۆی ئەم فەرمانەوە،یان بیسرینەوەولایبەرین بەهۆی فەرمانیdelete–ەوە.هەروەها گۆڕینی ناویش ئەنجامدەدرێت بەهۆی فەرمانی**rename**–ەوە،کەبە دەبڵ کلیکیش ئەنجامدەدرێت وەك پێشتر باسمانکرد.

هەروەها بەکارهێنەر دەتوانێت بەهۆی ئەوفەرمانەی کەلەشێوەی سەهمێك دایەو،دەکەوێتە تەنیشت **present type**–وەگۆڕان لەشێوەو ،ناوەرۆکی بەشەکاندابکات،بەنموونەلیستی **pattern** وەردەگرین کەبەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین گۆڕانی زۆر ئەنجامبدەین وەك ئەوەی تەنهانوسینی بەشەکانی **pattern**–مان پیشان بدات،بۆئەمەش کلیك لەسەرtext onlyواتە تەنهادەق،یان بەشێوەی بچوك **small thumbnail**یان گەورە**large thumbnail**یان لیستی بچوك **small list**ولیستی گەورەlarge listوەهەروەها...




**٢١–preference**:پێکهاتووە لەکۆمەڵێك فەرمان:

*general:بەگشتی ،کەهەموو فەرمانەکان لەخۆ دەگرێت.

*file handling:

*display and cursor:

*transparence and gamut…

*unit and ruler..

* guids,grids and slices

*Plug –ins and search disks

Memory and image cache…*
File browser…*

## لیستی وێنە (Image)



١–**mood**:ئەم فەرمانە زیاتر بەشێوەیەکی گشتی پێوەندی بەجیاکردنەوەی ڕەنگەکانەوە هەیە ،بۆئەوەی ئامادەبکرێت بۆ
لەچاپدان،واتە بەمەبەستی فەرز کردن بەکاردێت کەبێگوومان بەکارهێنەری ئاسای فۆتۆشۆپ پێویستی پێینابێت ،ئەگەرچی بەڵێن دەدەم لەچاپی دوواتری ئەم بەرهەمەدا بەورترو،باشتر باس لەفۆتۆشۆپ دەکەم و،ئەوەی لێرەداجێمانهێشتووە دێینەوە سەری ،بەتایبەتی باسکردنی ئای کاندو،**kpt**–یەکان.
ئەگەرچی دەتوانین بۆ مەبەستی دیکەش سودی لێوەر بگرین ،بۆنمونە دەمانەوێت وێنەیەکی ملەوەن بکەینە ڕەشو سپی یەکی جوانی بەدیقە ،ئەوا بۆ ئەم مەبەستە کلیکی imageدەکەین پاشان دەچینەسەر modeوکلیکی grayscaleبکەین،یاخود بچینە سەر بەشی convert to profileولەبەشیprofile–دا٢٠٪working gray-dot gainیان یەکێك لەdot gain–نەکان هەڵبژێرین و،لەبەشی intentیشدا کالێ وتۆخی وشێوەی ڕەنگی وێنەکە بۆ تەبعکردن هەڵبژێرین.

*************

٢–**adjustment**:ئەم بەشە دەتوانرێت بەگرنگترین بەشی فۆتۆشۆپ دابنرێت و،زۆربەی گۆڕانکارییەکانی وێنەی لێوە ئەنجامدەدرێت هەربۆیە بەپێویستی دەزانم هەرفەرمانەو بەوردی لێی بدوێم :

***level...**:ئەم فەرمانە بۆ گۆڕنکاری لەڕەنگی وێنەدا بەکاردێت ،بەم شێوەیە:

١–بەهۆی **channel**–ەوە،ئەو بەشە دیاری دەکەین کەدەمانەوێت گۆڕانکاری ڕەنگی تیادابکەین،بەنمونە ئەگەر rgbهەڵبژێرین ئەوا بەزیاد کردن ،یان کەمکردن ڕەنگی هەموو وێنەکەدەگۆڕێت،وەبەهەڵبژاردنی rسور**red=**یان **g= green**سەوزیان **b = black**واتە ڕەش ،ئەوا گۆڕان لەڕەنگە هەڵبژێراوەکەدا دەکات بەتەنها.

٢–دەتوانین بەهۆی**input level**–ەوە،بەنووسینی ژمارە بەگوێرەی پێویست لە چوارگۆشەکانی تەنیشتیدا گۆڕانکاری لەڕەنگدا ئەنجامبدەین،یا بەهۆی زیاد و،کەمکردنی چەماوەکەی ژێرەوەی ئەم فەرمانکەبەماوسەکە زیاد ،یان کەمی دەکەین بگوێرەی پێویست.

٣–بەهەمان شێوەی خاڵی ٢–دەتوانین گۆڕان لەڕوناکی وێنەکەدا بکەین ،بەهەردوو ڕێگەکەی سەرەوە،یان بەنووسینی ژمارە لەچوار گۆشەکانی **output level**یان بەهۆی گۆڕانی چەماوەکانەوە بەماوسەکە بەگوێرەی پێویست.

٤–پاش ئەنجامدانی گۆڕانەکە **ok**–ی دەکەین ئەگەر گۆڕانەکەمان پێ جوانبوو،وەئەگەرنا کلیك لەسەر cancelدەکەین،بۆپاشگەزبوونەوە لەکارەکەمان.

٥–دەتوانین بەهۆی**save**–وە ،ئەوتەنسیقەی داومانە بەوێنەکە بیپارێزین و،خەزنی بکەین بۆ وێنەیەکی تر ،کەلەکاتی پێویستدا بەهۆی فەرمانی ...load–ەوە،دەیکەینەوەو،دەیدەین بەوێنەکە.

٦-بەكليك كردن لەسەرفەرمانیautoبەشێوەیەكی خۆی وێنەكە ڕەنگی دەگۆڕێت بەگوێرەی پێویستی وێنەكە،ئەم فەرمانە لەلایەن بەرنامەی فۆتۆشۆپ خۆیەوە ئەنجامدەدرێت بێئەوەی بتوانین دەستی بەسەردا بگرین.

٧-بەهۆی فەرمانی...option -ەوە،دەتوانین گۆڕان و،هەڵبژاردنی زیاتر ئەنجامبدەین وەك سێبەر shadowیان پێدانی ڕەنگێك بەهەموو وێنەكەhighlightیان هەڵبژاردنی یەكێك لەسیٚ شێوە لۆگاریسمی یەكەenhance monochromatic contrastیانenhance per channels contrastیان find dark and light color- كەهەریەكەو شێوەیەك دەبەخشێت بەچەماوەی گۆڕانكاری ڕەنگ لە پەنجەرەی پێشتردا.وەهەروەها گۆڕانی تریش..

پاشان ok دەكەین و،دەگەڕێینەوە بۆ پەنجەرەی پێشوو.

٨-بەكليك كردن لەسەر چوارگۆشەی بەردەمpreviewدەتوانین بەرلەok -ی كردن بۆ گۆڕان لەسەر وێنەكە ڕاستەو خۆ پێشان مان بدات ،كەبەو دەستكاری كردنەی ئێمە چ گۆڕانێك لەسەر وێنەكە ڕوودەدات.







* auto level: ئەم فەرمانە بەشێوەیەكی خۆی گۆڕان لەڕەنگی وێنەكدا ئەنجام دەدات.



*فەرمانی auto contrast –یش،بەهەمان شێوە گۆڕانەکەی خۆی دەبێت.




*auto color: یش وەک فەرمانە خۆییەکانی پێشتر گۆڕانی خۆی لەڕەنگی وێنەکەدادەکات.




**************

*curves:ئەم بە شەش وەک فەرمانی levelدەتوانین گۆڕانکاری لەڕەنگدا ئەنجامبدەین،بەم شێوەیە:

١–بەهۆی لاکێشە _هەڵبژاردنەکانی بەردەمchannel–وە ،دیاری دەکەین ،کەئایاگۆڕان لەهەموووێنەکەدا بکەین،ئەواRGBهەڵدەبژێرین،وەگەر گۆڕان لەڕەنگی سوردابکەین،ئەواred–هەڵدەبژێرین،وەبۆ ڕەنگی شین blue،وەبۆڕەنگی سەوزgreenهەڵدەبژێرین،کەلەم بارانەدا تەنها گۆڕان لە ڕێژەی ڕەنگی دیاری کراو،وەهەڵبژێردراودا ڕوودەدات.

٢–هەروەها دەتوانین بەهۆیsaveەوە،ئەم تەنسیقەسەیڤ بکەین و،بیپارێزین کەپاشان دەتوانین بۆ وێنەیەکی تری بەکاربهێنین،کەبەهۆی فەرمانی load...–وە دەبێت.

٣–فەرمانی autoبەشێوەیەکی خۆی ڕەنگی وێنەکە دەگۆڕێت.

٤–فەرمانی ...optionبەهەمان شێوەی فەرمانی option–ی levelوایە بۆیەدووبارەی ناکەینەوە.

٥–دەتوانین سود لەهێمای قەڵەمەکەوەربگرین بەهۆی ماوسەکەوە بۆ کێشانی هێڵی چەماوەکە،یان هێماچەماوەکەی تەنیشتی.

٦–بە کلیك کردن لە چوارگۆشەی بەردەم وشەی previewئەوا چ گۆڕانێك لە وێنەکەدا ئەنجام بدەین ڕاستەو خۆو بەرلە okکردن پیشان مان دەدات.

٧–لە کۆتایدا ئەگەر گۆڕانەکەمان پێجوان بوو کلیکی فەرمانیok–ی دەکەین،وەگەر ویستمان پەشیمان ببینەوە لەو کارەی کە کردوومانە کلیکیcancelدەکەین.

سەرنج : فەرمانی saveو ...loadبە ویستی خۆمانەو دەتوانین بەکاری نەهێنین.

٨–لە کۆتای لای ڕاستی پەنجەرەکەدا هێمای سەهمێك لەنێو چوار گۆشەیەکدا هەیە ،کە چوار گۆشەیەکی بچوکی پێوە لکاوە ،و بەکلیك کردنی دەتوانین پەنجەرەکە گەورەبکەین وەبە پێچەوانەوە.




**...color balance *: ئەم بەشە بەکاردێت بۆگۆڕینی ڕەنگی بەشێکی سەلێت کراو.**

بەنموونە ئەم وێنەیەی بەردەستت دوای ئەوەی ئەو بەشەمان سەلێکتکرد وەك لەوێنە کەدا دیارە پاشان ئەم فەرمانە هەڵدەبژێرن ،کەپێکهاتووە لە:

١–color balance: و بە هۆی ئەم بەشەوە دەتوانین چ ڕەنگێکمان ویست بیخەینە شوێن ڕەنگی بەشە هەڵبژێردراوەکە،بەهۆی ئەو ئامرازی گۆڕانانەی لەنێوان هەر دوو ڕەنگێکدا هەیە.

٢– بەهۆی tone balance–وە دیاری دەکەین کەئایا بەشی دیاری کراوی وێنەکە کەدەمانەوێت بیگۆڕین سێبەرshadowی هەبێت،یای ڕوناکی high lightهەبێت،یان....وە بەکلیك کردنی چوارگۆشەی بەردەم preserve luminosityئەو ڕەنگەی دەستمان دەکەوێت بەهۆی گۆڕانەکەوە ڕوونتر دەردەکەوێت.

٣–بە کلیك کردن لەناو چوارگۆشەی preview–ڕاستەوخۆو بەرلە کلیك کردنیokگۆڕانەکانمان پیشان دەدات.

٤- دەتوانین لەکۆتایدا کلیکی okبکەین،یان کلیکەcancelولەکارەکەمان پاشگەز ببینەوە.




**brightness/contrast*: ئەم فەرمانەلە دوو بەش پێکهاتووە :**

١-فەرمانی brightness بەکاردەهێنرێت بۆ ڕونکردنەوە ،یان تاریك کردنی وێنەیەك.

٢-فرمانیcontrastبەکاردەهێنرێت بۆ تۆخکردنەوەی ڕەنگەکانی وێنەیەك،یان کاڵکردنەوەی.

٣-بەکلیککردن لەنێو چوار گۆشەی previewبەرلەokی کردن گۆڕانەکەمان پیشاندەدات،کەبەسەر وێنەکەدا دێت.

٤-لەکۆتایدا ok-ی ،دەکەین.




**hue/ saturation*: ئەم فەرمانەبەکاردەهێنرێت بۆ مەبەستی گۆڕینی ڕەنگی جل وبەرگ ،وەك لەنموونەکەدا ڕوونکراوەتەوە:**

ئەگەر بمانەوێت بەشی سەرەوەی جلی ئەوخانمە لەڕەنگێکەوە بگۆڕین بۆ ڕەنگێکی کە،ئەوا لەپێشدا سەلێکتی دەکەین،پاشان کلیك لەسەر ئەم فەرمانەhue/saturationدەکەین و،لەبەشیhue-دا ،ئەڕەنگە دیارە دەکەین کەپێی دەگۆڕین،ولەبەشی saturation-دا تۆخی وکاڵی و،لەبەشیlightness-دا،ڕوناکی ڕەنگەکەهەڵدەبژێرین.

هەروەها دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت کەبەر لەدەستکاری کردنی وێنەکەو،بەکاربردنی hue/saturation/lightnessکلیکی چوارگۆشەی بەردەم ڕەنگ کردنcolorizeبکەین لەگەڵ چوارگۆشەی بەردەم previewبۆئەوەی گۆڕانی ڕەنگەکەمان پیشان بدات بەرلە okکردن.

دەتوانین وەك فەرمانەکانی دیکە ئەو گۆڕانکارییەی ئەنجامی دەدەین وەك گۆڕانکارییەکی ئامادەکراو،خەزنی بکەین بەهۆی فەرمانیsaveوە،وەبۆ وێنەیەکی دیکەبەکاریبهێنین و،بەهۆی فەرمانی load.

دوای تەواوبوونی کردارەکان ok– دەکەین.




*فەرمانی **desaturate** تەنها یەك بەکارهێنانی گرنگی هەیە ئەویش گۆڕینی وێنەی ملەوەنەبۆ ڕەشوسپی.

سەرنج: فەرمانی desaturateبۆ بەشێکی سەلێکت کراویش بەکاردێت،واتە تەنها بەشە سەلێکت کراوەکە دەکاتە ڕەشو سپی ،نەك هەموو وێنەکە.



***فەرمانی match color– زۆر گرنگەو ،گۆڕانی زۆری پێدەکرێت بەم شێوەیە:**

**لەپێشدا وێنەکە دەکەینەوە پاشان دەچینەسەر ئەم فەرمانەو،کلیك دەکەین ،دەبینین پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە وەك لەوێنەکەدا دیارەو،گۆڕانەکان بەم شێوەیەدەبێت تیایدا:**

**١–image option: ئەم بەشە لەچەند فەرمانێك پێکهاتووە:**

***luminance:ئەم فەرمانە وێنەکەمان بۆ دەگۆڕێت بەهۆی دروستکردنی چینێك ،کە یان وێنە تۆخ دەکات،یان کاڵی دەکاتەوە بەشێوە چین بیٚ ئەوەی دەستکاری ڕەنگی بنچینەی وێنەکەبکات،واتە چینێکی کاڵ،یان تۆخ بەسەروێنەکەدا دەدات بەپێی گۆڕانەکە.**

***color intensity:بەهۆی ئەم فەرمانەوە ڕەنگی وێنەکەمان تۆخ،یان کاڵدەکەین.**

***fade:ئەم فەرمان بە کلیك کردن لەناو چوارگۆشەی بەردەمneutralizeچالاك دەبێت و،بەهەمان شێوەی پێشوو گۆڕان لەڕەنگی وێنەدا ئەنجامدەدرێت بەهۆیەوە.**

**٢–image statistics: بەهۆی ئەمفەرمانەوە دەتوانین:**

***ئەگەر چەند وێنەیەکمان کردبێتەوە کاریگەری هەریەکەیان بەهەڵبژاردنیان لەناوsourceدا بخەینەسەر وێنەی چالاکی سەر شاشەکە.**

***بەهۆی ...load–وە،هەرشێوەیەی خەزنکراومان هەبێت لە image statisticsبیکەینەوە،وەبەهۆی save–یەوە ئەوەی ویستمان خەزنی بکەین وەك.(sta)**



*** فەرمانی replace colorواتە دانانی ڕەنگ لەبری و،بەم شێوەیەکاری پێدەرێت :**

١–ئەگەربمانەوێت ڕەنگێك لەهەموو وێنەکادا بگۆڕین ،ئەوادوای ئەوەی وێنەکەمان کردەوە،چوینە سەر ئەم فەرمانەدەبینین وێنەکە لەبەشێکی پەنجەرەکەدا بەتەواوی کراوەتەوەو،لەبەشیselectionدا ئەوڕەنگە هەڵدەبژێرین کەدەمانەوێت بیگۆڕین،پاشان دەچینە سەر بەشی گۆڕانکاری ولەجیاتی دانانreplacementو،دەستکاری وێنەکەدەکەین بەهۆی هەرسێ بەشیhue/saturation/lightnessوەك لەپێشترو لەفەرمانەکانی تردا باسکراوە.

هەروەها لەبەشی fuzziness–دا دەتوانین بەشی selectکراو گەورە یان بچوك بکەینەوە،وەبەهۆی کلیککردن لەچوارگۆشەی بەردەمpreviewبەرلەوەی ok–ی بکەین،ئەنجامی گۆڕانی سەر وێنەکەمان پیشاندەدات،وەداتوانین بەهۆی کلیککردن لەسەر یەکێك لەدوو دراوەکەی ژێروێنەکە دەستنیشانی بکەین کەئایا هەموو وێنەکەمان پیشان بدات image،یا بەتەنها بەشی هەڵبژێردراوselect.هەروەها وەك هەموو فەرمانەکانی تر دەتوانین ئەوگۆڕانەی ئەنجاممانداوە بەهۆیsave–وە بیپارێزین بۆ وێنەیەکەتر ،کەبەهۆی load...–وە دەیکەینەوەو پێی یەدەین.

لەکۆتاییدا ئەگەر گۆڕانەکەمان پێجوان وباشبووok–دەکەین،یان بەcancelپاشگەزدەبینەوە لەگۆڕانکارییەکە.

٢–بۆبەشێکی سەلێکتکراو(هەڵبژێردراوselect) بەهەمان شێوەیەو،تەنها جیاوازی ئەوەیەکە لەبەشی selection–دا خۆی ڕەنگی بەشە هەڵبژێردراوەکەselectمان پیشاندەدات،بەنموونە ئەگەر بمانەوێت جلی سەرەوە ئەوخانەی وێنەکە بگۆڕین،یان ڕەشی برۆوچاوەکانی تۆخبکەین.



***فەرمانی هەڵبژاردنی ڕەنگ selectiveکە پێکهاتووەلەم بەشانە:**

١-colors:لەم بەشەدا ئەو ڕەنگەی وێنەکە دیاری دەکەین کەدەمانەوێت بیگۆڕین،بەنموونە دەمانەوێت ڕەنگی زەردی قژی ئەوخانمەی لەوێنەکەدا دیارە تۆخبکەینەوە،یان بیگۆڕین ئەوا لێرەدا ڕەنگی زەرد هەڵدەبژێرین پاشان ئەگەر ویستمان تۆخی بکەین دەچینەسەر بەشی تایبەت بەڕەنگی زەرد لە بەشەکانی ژێر ڕەنگە هەڵبژێردراوەکەواتەyellowو ڕێژەکەی دەکەین بە٪١٠٠ی تۆخی واتە+وەبەپێچەوانەشەوە.

گۆڕانکاری لەڕەنگی دیکەشدا بەهەمان شێوەدەبێت cyanوmagentaوblackوەك لەسەرەوەباسکراوە،هەروەها دەتوانین چەند ڕەنگێك تێکەڵبکەین و،ڕەنگێکی نوێ دروست بکەین.

٢-لەبەشی **method**دا دوهەڵبژاردنمان هەیە کەبەگوێرەی پێویست یانrelativeهەڵدەبژێرین کەوێنەکە ڕونتردەبێت،یانabsoluteهەڵدەبژێرین کەوێنەکە تۆختر دەبێت.

٣-بەهەمان شێوەی فەرمانەکانی تر دەتوانین ئەو گۆڕانەی کردوومانە خەزنی بکەین بەهۆیsave-وەو،بەهۆی...load-وە بیکەینەوەو،بیدەین بەوێنەیەکی تر.

٤-کلیك لەچوارگۆشەیpreviewدەکەین بۆئەوەی بەرلەok-ی کردن گۆڕانەکەمان پیشان بدات لەسەر وێنەکە.

٥-لەکۆتایداokی دەکەین ئەگەر گۆڕانەکەمان پێجوان بوو ،یان cancelدەکەین ئەگەر نەمان ویست.

سەرنج:باشتر وایە ئەوبەشەی دەمانەوێت گۆڕانی ڕەنگی تیا ئەنجام بدەین لەوێنەکەدا بەر لەچونە سەر ئەم فەرمانەselectی بکەین.وەك لەوێنەکەدا دیارە.






*** فەرمانی چەناڵی تێکەڵکردنCHANNEL MIXTURE بۆ تێکەڵکردن وگۆڕانی ڕەنگەسەرەکی یەکانە (سور–سەوز–شین) :**

١–لە output channelدا یەك یەك ڕەنگەکان هەڵدەبژێرین بۆ تێکەڵکردنیان کە پێکهاتووە لەسێ ڕەنگەسەرەکی یەکە(سور،سەوز،شین)

٢–لە source channelەوە ڕێژەی هەریەك لە ڕەنگەکان زیاد یان کەمدەکەینەوە.

٣–لەconstantەوە ،دەرکەوتنی کاڵی وتۆخی ڕەنگی هەڵبژێردراولەoutput channelدا،دیاری دەکەین.

٣–ئەگەر کلیك لەسەرmonochromeبکەین ئەوا وێنەکەمان بۆ دەکاتە ڕەساسیgray.

٤–وەك فەرمانەکانی تر دەتوانین بەهۆیsave–یەوە ئەم گۆڕانەخەزن بکەین و،بەهۆیload...–یەوە بیکەینەوەوبیدەین بەوێنەیەکی تر.

٥–ئەگەر کلیك لەناو چوارگۆشەی بەردەم previewدا بکەین،ئەوا گۆڕانەکەمان پیشاندەدات بەرلەok–ی کردن.

٦–لەکۆتایداok–ی دەکەین ئەگەر گۆڕانەکەمان بەدڵ بوو،یان cancel–دەکەین و،پەشیمان دەبینەوە.




*** فەرمانیgradient map(نەخشەی گرادییەنت) کەپێهاتووە لە:**

١–گرادییەنت بەکارهێنان بۆ نەخشە(وێنە)ی ڕەشوسپیgradient used for mappingکە بەهۆی ئەم بەشەوە دەتوانین نەخشە ڕەنگێکی ئامادەکراو هەڵبژێرین،کەبەهۆی ئەو سێ گۆشەبچوکەی لەبەشی لای ڕاستدایە ڕەنگەکان دەبینین و،دەتوانین گۆڕانی تەواو لەڕەنگەکاندا بکەین دوای ئەوەی کلیکمان لەسەر کرد لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە بەم شێوەیەوەك لە وێنەکەدا دیارە کەبەهۆیەوە دەتوانین بەتەواوی دەستبەسەر ڕەنگەکاندا بگرین وشێوازی دەرکەوتنی ڕەنگەکان دیاری بکەین،بەم شێوەیە:

١– new gradient: ئەم فەرمانە بەکار دەهێنرێت بۆ دروستکردنی گرادییەنتێکی نوێ و،تازە.

٢–rename gradient:بەکاردەهێنرێت بۆ دووبارە ناونانەوەی گرادییەنتێك،واتە بۆ گۆڕینی ناوی گرادییەدێنتێك.







٣–delete gradient:بەکاردێت بۆ سرینەوەیgradient–یك.

٤–text only:بەکاردێت بۆپیشاندانی gradient–تەنها بەشێوەی نوسین ،واتە وێنەی gradient–کە نابینین،تابزانین ڕەنگەکەی چۆنە.

٥–small thumbnail:بۆ پیشاندانی gradientبەشێوەی نینۆکی پەنجە بەبچوکی.

٦–large thumbnail:بەکاردێت بۆ پیشاندانی gradientبەشێوەیەکی گەورەتر لەخاڵی پێشووتر.

٧–small list:بۆ پیشاندانیgradient بەشێوەی لیستێك بەنوسین و،وێنەشەوەبەشێوەیەکی بچووك.

٨–large list:بەکاردەبرێت بەمەبەستی پیشاندانی gradientبەشێوەی لیستێکی گەورە بەنوسین و،وێنەشەوە.

٩–preset manager:بەهۆی ئەم فەرمانەوە پەنجەرەیەکی نوێ دروست دەبێت.

١٠–resent gradient:دەتوانین بەهۆی ئەم فەرمانەوە کەبەکلیککردن لەسەری سێ هەڵبژاردنمان دەداتیappendهەڵبژێرین و،هەموو gradient–کانمان پیشان بدرێت.

١١–load gradient...:بۆکردنەوەیgradient یخەزنکراو.

١٢–save gradient:بۆ خزنکردنی gradient.

١٣–replace gradient:بەکاردێت بۆ دەانانی gradientێك لەبر gradientێکی تر.

١٤–color harmonies١وهەموو فەرمانەکانی دوای ئەو، شێوەو جۆری gradient–کە دەگۆڕێت،بەکلیك کردن لەسەر هەریەکێکیان بەجیا پاشان کلیککردن لەسەرappend ئەم کارە ئەنجام دەدرێت.

–بەکلیککردن لەناو چوارگۆشەی previewئەوابەر لە ok–ی کردن گۆڕانکاری وێنەکەمان پیشاندەدات.

–بەکلیککردن لەناو چوارگۆشەی ditherڕەنگی for ground–مان بۆ دەگۆڕێت بەڕەنگی gradient–ەکە.

-بەکلیککردن لەناو چوارگۆشەیreverseڕیزکردنی خۆی gradient-ەکەمان بۆ پێچەوانە دەکاتەوە لەڕەنگدا.

-لەکۆتایدا okی دەکەین ئەگەر گۆڕانەکەمان بە دڵبوو یان cancelدەکەین و،پاشگەزدەبینەوە ئەگەر نەمانویست.

## * فەرمانی photo filter:

بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین لەبەشیfilterدا ڕەنگێك ،یان شێوەیەك هەڵبژێرین و،بەهۆی density-ەوە ،ڕێژەکەی بگۆڕین،یان دەتوانین بەهۆی كلیك كردن لەناو بازنەی بەردەمcolorبەشی ڕەنگ چالاك بکەین ،وتەنها لەڕەنگدا کاربکەین.

وەك هەرفەرمانێکی دیکە لەکۆتایداok-ی دەکەین،ئەگەر بەدڵمانبوو،یان cancel-دەکەین ئەگەر پەشیمان بووینەوە لەگۆڕانەکە.




## * فەرمانیshadow/highlight:

ئەم فەرمانە بریتی یە لەدوو فەرمانی سەرەکی کەئەوانیش shadowواتە سێبەر کەبەهۆیەوە دەتوانین بڕی سێبەرەکەamountدیاری بکەین کەبەشێوەی ڕێژە زیاد یان کەمی دەکەینەوە.

هەروەها بەشی دووەمیش بەهەمان شێوەیە کەhighlight-وە ،دەتوانین بەهۆسەوە ڕوناکی یەك بدەین بەوێنەکە ،کەئەمیش هەربەڕێژەیە.

-دەتوانین وەك هەرفەرمانێکی تر ئەو گۆڕانەی ئەنجامی دەدەین خەزنی بکەین،بەهۆیsave-وەوهەڵیبگرین بۆ وێنەیەکی تر کەپاشان بەهۆی...load-وە دەیکەینەوەو،دەیدەین بەوێنەکەی کەدەمانەوێت.



–بەكليك كردن لەناو چوارگۆشەیshow more optionواتە پيشاندانی هەڵبژاردن(ئيختيار)ی زياتر ،پەنجەرەكەمان بۆ گەورەدەكات و ،هەڵبژاردنی زياترو،وردترمان دەداتیٚ.

–بەكليككردن لەناو چوارگۆشەیpreview–پێش okی كردن گۆڕانەكانمان پيشاندەدات.

–لەكۆتايداok–ی‌دەكەين ئەگەر ويستمان وەئەگەرناcancelدەكەين.

*********

## ٣–فەرمانی duplicate image:ئەم فەرمانە بەكار دەهێنرێت بۆ دوانە كردنی وێنەی

كراوە وچالاكی سەر شاشە،واتە بەهۆی ئەم فەرمانەوە وێنەكەی سەرشاشەكە دەكەين بەدووان،كەدووایكليككردن لەسەری پەنجەرەيەكی بچوكمان دەداتیٚ كە ناوێك لەناويدا دەنوسين پاشانok–ی دەكەين ،ئەمەش سودی خۆی هەيە لەهەندێك كاتدا كەدەتوانين دەستكاری لەيەكێكياندا بكەين وەك مسوەدەيەك و،ئەوەی تريان هەڵبگرين بۆكاتی پێويست،بەنموونە من وێنەكەم ناوناوەsh.i.t center




********

## ٤–فەرمانی apply imageكەپێكهاتووە لەم بەشانە:

– source:واتە سەرچاوە ،كەناو و،شێوەی وێنەكە ،واتە پاشگری وێنەكەمان پيشاندەدات.

–layer:دەتوانين بەهۆيەوەچينەكانی وێنەكەمانی پێدياری بكەين،واتەهەڵيان بژێرين و،گۆڕانكارييان تيا بكەين يەك يەك.

–channel:بەهۆيەوە ڕەنگ هەڵدەبژێرين كەهەرچوار ڕەنگە سەرەكی يەكەی تيادايە.

–لە target:دا ئەو ناوەی وێنەكەی پێوە خەزنكراوەو،پاشگرەكەی و،جۆری ڕەنگدارييەكەی دەنوسرێت.

–لەبەشیblendingدا،دەتوانين گۆڕان لەڕەنگی وێنەكەدا بكەين بەهۆی بوونی چەند شێوەيەك تيايداوەكdarkenو....

–لە بەشیopacityدا ڕێژەی گۆڕانەكەدياری دەكەين ،كەباشتروايە.٪١٠٠بێت.

–لەبەشی ...MASKكەبەكليككردن لەناو چوار گۆشەكەی بەردەمی چالاك دەبێت ،چەند بەشێكی وەك LAYERوchannelدەبينين ،كەوەك پێشتركاردەكەن.

–لەكۆتايدای okی دەكەين.

سەرنج:لە بەشی channelدا دەتوانين يەك يەك ڕەنگەسەرەكی يەكان هەڵبژێرين،يان هەموويان پێكەوە واتە rgb.




*********

## ٥-فەرمانی calculation:

ئەم فەرمانە وەك فەرمانی سەرەوە وایە بەهەندێك جیاوزییەوە، كە لەدوای دا ڕوندەبێتەوە،بەم شێوەیە:

بەشی یەكەمی پەنجەرەكە:

١-source:واتە سەرچاوەی یەكەم،كەبەهۆیەوەناوی وێنەكەو،پاشگرەكەی دەزانین.

٢-layer:چینی وێنەكە،بەهۆیەوە دەتوانین كارلەچینەكانی  وێنەكەدابكەین.

٣-channel:چوار ڕەنگەسەرەكیەكەی تیادایە و،دەتوانین یەك یەك هەڵیان بژێرین و،گۆڕانیان تیائەنجامبدەین.

٥-invert:بۆ پاشگەزبوونەوە لەگۆڕان.

بەشی دووەمی پەنجەرەكە:

بەهەمان شێوەی بەشی یەكەمە تەنها ئەوەندە نەبێت لەجیاتیsource١دەبێتەsource٢

بەشی سێهەمی پەنجەرەكە:

١-لەبەشیblendingدا دەتوانین شێوەیەك (normal,darken,…..) هەڵبژێرین كەهەریەكەیان گۆڕانێك لەوێنەكەدا دروستدەكات.

٢-opacity:باشتروایە كە٪١٠٠بێت.

٣-…mask:بەكلیككردن لەناو چوارگۆشەكەی بەردەمی بەشێكیتر لەپەنجەرەكە زیاد دەكات،كەپێكهاتووەلەmask, layer, channel,invert

بەشی چوارەمی پەنجەرەكەپێكهاتووەلە:

Resultكەدەتوانین بەهۆیەوە شێوەی ئەنجامەكەی دیاری بكەین،كەبەشێوەی new documentبێت واتە وێنەیەكی نوێ تازەمان بۆبكاتەوە،یانnew channelبێت،یان بەشێوەی سەلێكتكردنی وێنەكەselectionبێت.

لەكۆتايدا okی دەكەين كەدەتوانين بە كليككردنی چوار گۆشەی بەردەمpreviewبەرلەokی كردن گۆڕانەكەببينين،يان دەتوانينcancelبكەين وپاشگەزبيينەوەلەكارەكەمان،لەكۆتايدا وێنەيەكی تری وێنە بنچينەيەكەمان دەستدەكەوێت بەگوێرەی دەستكاری كردنەكەمان ،واتە وێنەی دووەمی وێنە بنچينەيەكەمان دەستدەكەوێت.




*****

**٦–image size**:ئەم فەرمنە بەكاردێت بۆ دياریكردن و،گۆڕان لەقەبارەی وێنەدا،بەم شێوەيە:

بەشی يەكەمی پەنجەرەكە:

Pixel dimention–و،دەتوانين پانیwidthوبەرزیheightبگۆڕين،بەڵام بەهەرگۆڕانێك تيايدا گۆڕان لەdocument sizeيشدا ڕوودەدات تەنها لەبارێك دانەبێت وەك دوای باسیدەكەين.

بەشی دووەمی پەنجەرەكە:

Document sizeو،دەتوانين پانی widthو،بەرزیheightوديقەی وێنەكەresolutionدياری بكەين.

بەشی سێهەمی پەنجەرەكە:

ئەگەر كليك لەناو چوارگۆشەی بەردەمresample imageدا نەكەين ئەواتەنها بەشی document sizeچالاك دەبێت و،دەتوانين گۆڕانی تيابكەين ،وەبەپێەوانەشەوە.

بەشی چوارەمی پەنجەرەكە:

–ok:یكردن دوای دياری كردنی بەشەكانی سەرەوە.

–cancel:ئەگەر ويستمان ئەو فەرمانە جێبەجێنەكەين.




–...auto:بەشێوەیەکی خۆی حەجمی وێنەکەی پێدیاری دەکەین،و بەکلك کردنی پەنجەرەیەکی بچوکمان بۆ دەکاتەوە کەسیٚهەڵبژاردنی تیایەgoodوbestوdraft،هەروەها دەتوانین لەبەشی screenیشدا حەجمێکی پێبدەین،وەك لە وێنەی پەنجەرەکەدا دەبینن کەline/inch ١٣٣مان داناوە.




*************

٧–فەرمانی canvas size:ئەم فەرمانە تاڕادەیەك لە فەرمانی پێشوو دەچێت،بەڵام جیاوازی لەکار کردنیانداهەیە ...

بەشی یەکەمی پەنجەرەکە:

لەم بەشە sizecurrent هەریەك لەپانیwidthوبەرزیheightوێنەکەی کردوومانەتەوە،چالاکەو لەسەرشاشەکەیە دەنووسرێت.

بەشی دووەمی پەنجەرەکە:

دەتوانین لەم بەشیقەبارە نوێیnew sizeیەدا و،لەبەشی widthواتە پانی بنوسین کەکەمتربێت لەپانی وێنەکەی کردوومانەتەوە،لەبەشی بەرزیشدا بەرزییەکی نوێی کەمتر لەبەرزی یەکەی سەرەوە(بەشی یەکەمی پەنجەرەکە)و،پاشان کلیك لەسەر چوار گۆشەیبەردەمrelativeدەکەین و،دەبینین لەجێگەی نوسینی پانی و،بەرزییەکەی پێشتر جیاوازی نێوان پانی و،بەرزی current sizeوnew sizeمان بۆدەنوسێت بەشێوەی ناقس(–)لەناوnew sizeدابەokیکردنی وێنەکەمان

بۆبچوکدەکاتەوەکە دەتوانین بەرلەokی کردن بەهۆی anchrوە چۆنییەتی قرتاندنی بەشی دیاری‌کراو بۆ بچووککردنەوەی وێنەکەدیاری بکەین کەئایا لای ڕاستی وێنەکەوە بچوکی‌بکاتەوە،یان لای چەپەوە،یان لەسەرەوە،یان لەخوارەوە،یان لەناوەڕاستەوە.

بەشی سێهەمی پەنجەرەکە:

دەتوانین لەcanvas extension colorدا یەکێك لەforegroundیانback groundیان ڕەنگێكblackویانی هی‌ترotherهەڵبژێرین.

لەکۆتایداokی دەکەین ئەگەر ویستمان وەبە پێچەوانەوەcancelدەکەین.




*************

٨–فەرمانی pixel aspect ratioکەپێکهاتووە لەچەند بەشێك و،بەهۆیەوە دابەشبوونی پیکسلاتی وێنەکە دیاری دەکەین بەم شێوەیە:

١–custom pixel aspect ratio:بەهۆی ئەم فەرمانەوە پیکسڵی وێنەکە دیاری دەکەین کەبەکلیککردنی پەنجەرەیەکی بچوکمان بۆدەکاتەوە کەتیایدا ناوی وێنەکەnameوفاکتەری factorی دیاری کردنەکەی تیادایەکەدەبێتلەنێوان٠,١٠٠بۆ١٠,٠٠٠بێت.

٢–delete pixel aspect ratio:بەکاردێت بۆسڕینەوەی فەرمانی پێشوو.

٣–reset pixel aspect ratio:لەبری دانانی پیکسلەکە.

٤–بۆ دیاری کرنی شێوەی وێنەکەبەکار دەهێنرێکەئایا چوار گۆشەیsquareبێت،یان....



**********

٩-فەرمانیrotate canvasئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ خولانەوە و،سوڕانی وێنەکە بەشێوەی ١٨٠و٩٠cwو٩٠ccwوarbitraryکە پەنجەرەیەکی بچوکمان بۆدەکاتەوەو،دەتوانین تیایدا بەگوێرەی پێویست گۆشەیەك بنووسین وشێوەی سوڕانەوەکشیcwیانccwدیاربکەین،وەهەروەها هەریەك لەflip canvas horizontalوflip canvas verticalدیاریبکەین .(کەلەبەشی١٤ی لیستی editدابەوردی باسکراوە بۆیەلێرەدا بەسادەی باسمانکرد)




***********

١٠-فەرمانی cropبەکاردێت بۆبڕین و،دانانی بەشێکی سەلێکتکراو لە فایلێکی نوێدا کەبەهۆیەوە فایلەکۆنەکەش_وێنەکۆنەکە_لادەچێت.وەك لەم نموونەیەدا ڕونکراوەتەوە.







****************

١١-فەرمانی...trim

ئەگەرلاپەڕەیەکی نویێ بکەینەوە بەهۆی فەرمانیfile>newو،پاشان بەهۆی فەرمانی اله tool boxدا نووسینێك بنووسین وەك نووسینەکەی منکەلێرەدا نووسیومە k.i.t center سەنتەری

زانیاری تەکنیکی کوردی،ئەوابەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین بەشەزیادەکانی چواردەوری نووسینەکە ،یان تەنها بەشێکیان کەخۆماندیاریدەکەین لەپەنجەرەی فەرمانەکەدا بەم شێوەیە:

–هەڵبژاردنی یەکێك لەtop left pixel colorیانbottom fight pixel colorبەکلیککردن لەناو بازنەکەی بەردەمیاندا.

–دیاری کردنی شێوەی بڕینی زیادەکەئایا بەشی سەرەوەtopبێت،یان بەشی خوارەوەbottomیان لایڕاستrightیانلای چەپleftیان هەمووی کەئەگەر ویستمان هەرچوار لاکەی بێت ئەواکلیك لەناو چوار گۆشەی بەردەم هەرچوار هەڵبژاردنەکەدەکەین،وەبەپێچەوانەشەوە.

–لەکۆتایداokی دەکەین،یاcancelدەکەین و،لەکارەکەمان پەشیمان دەبینەوە.







************

trap…

# ➢ لیستی چینەکان layer



لیستی چینەکان گرنگی‌یەکی زۆری‌هەیە لەفۆتۆشۆپ دا،بۆپێکهێنان و،دروستکردنی وێنەیەکی‌نوێ بەهۆی تێکەڵکردنی چەند وێنەیەك بەشێوەی چەند چینێك،لەبەرئەوە بەپێویستی دەزانم کەزۆر بەوردی و،باشی لێی بدوێم و،بەنموونەوە باسی‌بکەم:

**١- فەرمانی new:** کەپێکهاتووەلە:

layer–:ئەم بەشەی فەرمانەکە بەکاردێت بۆکردنەوەی چینێکی نوێ،کە دەتوانین تیایدا ناوی چینەکەname و،ڕەنگ color،mode و opacity ی چینەکە دیاری بکەین.

layer from background–:بەکاردەهێنرێت بۆ دروستکردنی‌چینێك لەباکگراوەند ،کەبەهەمان شێوە و،پێکهاتەی پەنجەرەی new وەو،هیچ جوداییەکی‌نی‌یە تەنهائەوەندانەبێت کەئەم فەرمانە خۆی چینەنوێیەکەمان بەناوی background وە بۆدەکاتەوەو،دەتوانین ئەم کارە بەفەرمانی پێشوش ئەنجامبدەین بەلاَم خۆمان ناوی چینەکەبکەین بەbackground.

layer set…–

layer set from background…–

layer via copy–:بەکاردەهێنرێت بۆکۆپی‌کردنی چینی چالاك(ئەکتیڤ)،واتە دروستکردنی چینێکی وەك چینەکۆنەچالاکەکە.

layer via cut–:ئەم بەشەی فەرمانەکە بەکار دەهێنرێت بۆ برین و،لابردنی چینی چالاکی ناو چوار گۆشەی لەیەرەکان.




******************

**٢-duplicate layer set…:** بەکاردەهێنرێت بۆ دووانەکردنی چینێك،کە چالاکە لەو کاتەدا



**٣–delete**:بەكاردەهێنرێت بۆسرینەوەی چینی چالاك.

****************

**٤–layer properties**:ئەم فەرمانە بەكلیككردن لەسەری چالاك دەبێت،وپەنجەرەیەكی بچوكمان بۆدەكاتەوە،كە دەتوانین بەهۆیەوە ناوێك بۆچینی چالاك هەڵبژێرین و،لەناولاكێشەی nameدا بینووسین،وەلەناو چوارگۆشەی colorیشدا رەنگێك هەڵبژێرین و،okی بكەین كە لەناو چوار گۆشەی (پەنجەرەی ) تەنیشتی لەیەردا ئەو چینەی وامان لێكردووە رەنگی هەردووبەشی چالاك كەر دەگۆڕێت بەورەنگەی پێشتر هەڵمان بژاردووە.




************

**٥–layer style**:ئەم فەرمانە لیستێك فەرمانی دیكەی لێدەبێتەوە كەبەپێویستی دەزانم یەك یەك باسیان بكەم :

–blending option:بە كلیككردنی پەنجەرەیەك دەكرێتەوە وەك لە وێنەكەدا دیارە، كە فێرخوازو،زانستخوازی هێژا زیاتر لەئەنجامی كاركردن و،تاقیكردنەوە تیایدا فێردەبێت .چونكە بەهۆیەوە دەتوانین چەندین گۆڕانكاری ئەنجامبدەین،وەك پێدانی ستایلێكی ئامادەكراوبەو چینەی كەپێش چالاككردنی ئەم فەرمانەلەناو پەنجەرەی لەیەردا هەڵمانبژاردووە بەكلیك كردن لەسەریبە كردنەوەی ستایلەئامادەكراوەكان لەبەشی styleدا كەبەكلیككردن دەبێت لەسەری پاشان كلیككردن لەسەریەك یەكیستایلەكان،یان بەهۆی بەشی default : blending optionوەكە پێكهاتووە لەكۆمەڵێك فەرمانی زۆر وەك سێبەرdrop shadowبەبەشی سەڵكتكراو ،وەهەروەها...

لە كۆتاییشداokی دەكەین ،پاش ئەنجامدانی گۆڕانكاریەكان،یان cancelدەكەین ئەگەر گۆڕانەكەمان پێجوان نەبوو،وپەشیمان بووینەوە .



–drop shadow:دیارە ئەم بەشانەی لەمەو دوا باسیان دەکەین ،لە پەنەرەی فەرمانی پێشوشداهەیە لێردا بەکەمێك جیاوازیەوە دووبارە دەبێتەوە بۆ لێرەدا باسیان دەکەین،ئەم فەرمانە پێکهاتووەلە:

١–structure:ئەمیش پێکهاتووەلەچەند بەشێکیبچوکتر:

*blending:دەتوانین بەهۆی ئەم بەشەوە دوو فەرمان ئەنجامبدین ئەوانیش ،هەڵبژاردنی ڕەنگی سێبەرەکەیە ،لەگەڵ شێوەی سێبەرەکە کە ئایاnormalئاسای بێت،یان تاریكdarkenیان ڕۆشن lightenیان....

*opacity:کەبەهۆیەوە کاڵی وتۆخی سێبەری چینەکەدیاری دەکەین،واتە شێوەی ڕەنگی چینەکە

*angle:بۆدیاری کردنی گۆشەی سێبەرەکەسودمەند دەبین لێی،وەبەکلیکردنی چوارگۆشەیبەردەمused global lightشوێنی سێبەرەکە پێچەوانە دەکەینەوە.

*بەهۆی ئەم سێ فەرمانەوە distance,spread,sizeوە،شێبەرەکە دروستدەکەین و،قەبارەکەی دیاردەکەین.

٢–quality:بەهۆیەوە چۆنی یەتی سێبەرەکە دەستنیشان دەکەین

@@@@

–inner shadow:دەتوانین بڵێن تاڕادەیەکی کەم ئەم فەرمانە وەك فەرمانی پێشوو وایە لەکارکردن بەلاّم لەئەنجامی کارەکەدا جیاوازە .چونکە لێرەدا و،بەئەنجامدانی ئەم فەرمانە دەتوانین سێبر دروستبکەین بەمانەوەی وێنەئەسڵیەکەو،دروستبوونی وێنەیکیتر لەسەر وێنە بنچینەییەکە،کەخۆمان دەتوانین حەجم و،شێوەو،چۆنیەتیەکەی دیاری بکەین،کەوەك فەرمانی پێشووە .

@@@@

–outer glow:ئەم فەرمانە بۆدروستکردن هێلێکی لێکنەپچراو بەکاردەهێنرێت بەدەوری بەشی هەڵبژێردراودا لەناو پەنجەرەی چینەکاندا کەدەتوانین بەهۆیەوە:

*blending mode:چۆنیەتی ڕەنگەکەی دیاری دەکەین وەك فەرمانی پێشوو.

*opacity:چۆنیەتی دەرکەوتنی هەیڵەکە دیاری دەکەین بەڕێژەی ٪١٠٠یان کەمتر بەگوێرەی پێویست.

*noise:بەهۆیەوە دیاری دەکەین کەئایا هێڵکیشراوەکە نوکتە نوقتەبێت ،یان ڕیك و لێنەپچڕاو.

*بەهۆی چوارگۆشەی ڕەنگەکەوە ڕەنگێك هەڵدەبژێرین،کەدەتوانین بەهۆی هەردوو بازنە بچوکەکەی تەنیشتی ئەم چوار گۆشەیەوە ڕەنگەکە پێچەوانە بکەینەوە لەچۆنیەتی دابەشبوونی دا،وەدەتوانین بەهۆی لاکێشەگەورەکەشەوە شێوە ڕەنگێکی ئامادەکراو هەڵبژێرین ،کەلەچەندا ڕەنگێکی ئامادەکراو پێکهاتووە،لەبەرنامەکە خۆیداهەیە.

*لەبەشیtechniqueدا دیاردەکەین کەئایا هێلێکی نەرمsofterبیت،یان precise.

*spread:پانی و،باریکی هێڵەکەی بەهۆوە دیای دەکەین.

*size:حەجمەکەی دیاری دەکەین.

*لەqualityدا چۆنییەتی یەکەی دیاری دەکەین.

لەکۆتایداokی دەکەین.

@@@@

–inner glow:ئەم فەرمانەوەك فەرمانی پێشو وایەinner shadowبەلاّم پێچەوانەی‌ی فەرمانی outer glowوە و،تەنها لەدیاریکردنی centerسەنتەر و،چوار دەوری وێنەکەedgeدا جیاوازەلە inner shadow.بۆیە باسی ناکەین.

@@@@

–bevel and emboss:ئەم فەرمانەپێکهاتووە لەچەند شێوە گۆڕانکارییەك ،بەنمونە بەهۆیەوە گۆڕان لەنووسینی سەر ئەم وێنەیەدا ئەنجامدەدەین،بەمشێوەیە:

*بەشی یەکەمی پەنجەرەکە:

–structure:

+style:بەهۆی ئەم بەشەوە مۆدێلێك هەڵدەبژێرین.

+technique:بەهۆی ئەم فەرمانەوە شێوەی تەکنیکی گۆڕانەکەدیاری‌دەکەین.

+deep:بەهۆی ئەم بەشەوە قوڵی بەشی دەستکاری کراو دیاری‌دەکەین.

+direction:ئاراستەکەی دیاری دەکەین ،کەئایا بۆ سەرەوەبێتup،یان بۆ خوارەوەdown.

+size:حەجمەکەی دیاری دەکەین بەهۆی ئەم فەرمانەوە.

+soften:زبری و،نەرمی شێوەکەی بەهۆیەوە دیاری دەکرێت.

بەشی دووەمی پەنجەرەکە:

–shading:

+angle:گۆشەکەی پیّ دیاری دەکەین.بە کلیککردن لەناو چوار گۆشەی‌بەردەم used global lightچالاك دەبێت

+gloss contour:ئەم فەرمانە بەکاردەهێنرێت بۆ پێدانی یەکێك لەشێوە خۆی یە ئامادەکراوەکانی بەرنامەکە بەو بەشەی کەمەبەستمانە.

+highlight mode:ئەم فەرمانە بەکاردەهێنرێت بۆ پێدانی شێوە و،ڕەنگێکی دیاری‌کراو.

+opacity:ڕێژەی شێوەو،ڕەنگەکەی پێدیاری دەکەین.

+shadow mode:بەکار دەهێنرێت بەمەبەستی پێدانی سێبەر .

+opacity:ڕێژەی سێبەرەکەی پێدیاری دەکرێت.

بەشی سێهەمی پەنجەرەکە:

+ok:ئەگەر ویستمان و،مەبەستمان بوو لەکۆتایداکلیکی لەسەر دەکەین.

+cancel:ئەگەر نەمان ویست گۆڕانەکە ئەنجامبدەینکلیکی لەسەر دەکەین.

+new style:بەکاردێتبۆ درستکردنی مۆدێلێکی نویّ،کەبەکلیککردن لەسەری پەنجەرەی new styleدەکرێتەوە کەپێکهاتووەلە :

*name:بۆ نوسینی ناوێك بۆ مۆدێلە نوێیەکە.

*include layer effect:کەئەگەر کلیك لەناو چوار گۆشەکەی بەردەمیدا بکەین ئەوا لە مۆدێلەنویّیەکەدا کاریگەری لەیەرەکە دەگرێتەوە.

*include layer blending option: بەكليك كردن لەناو چوار گۆشەكەی بەردەميدا ئەوا ستايڵە تازەكە هەڵبژاردەی چينەكە دەگرێتەوە.




@@@@

–satin: ئەم فەرمنە چەند شتێك دەگرێتەوە كە لەفەرمانی پێشتردا باسكراوە،بۆ بەپێويستی نازانم دووباريان بكەمەوە.

@@@@

–color overlay: ئەم فەرمانە لەتەنهاكارێك پێكهاتووە ئەويش بريتی يە لەگۆڕينی ڕەنگ ،بەنمونە گۆڕينی ڕەنگی نووسينەكەی پێشوو كەلەسەرەتادا بەسووردامانناوەوبەهۆی ئەم فەرمانەوە blend mode دەتوانين بيگۆڕينەبەهەر ڕەنگێكیتر كەدەمانەوێت هەروەها دەتوانين شێوەكەشی بگۆڕين لەگەڵ ڕێژەكەی opacity.



–gradient overlay:ئەم فەرمانە زۆر جێگەی بایەخە بۆیە بەنمونەوە و،زۆر بەوردی ڕوونی دەکەینەوە،ئەگەر نوسێنێك بنوسین و،باكگراوەندێكی بەهۆی گرادیەنت –ەوە بۆ دروست بكەین ،واتە دۆكۆمێنتێك كەلەدوو چین پێكهاتبێت پاشان لەپەنجەرەی چینەكانەوە باكگراوەندەكەسەڵكت بكەین و،ئەم فەرمانەی تیادا جێبەجێبكین،كەبەم شێوەیەدەبێت:

١– blend modeوopacity:لەفەرمانی پێشتردا باسكراوە.

٢–gradient:بەهۆیەوە شێوەیەك هەڵدەبژێرین بەدڵی خۆمان كەبەهۆی كلیككردن لەناو چوار گۆشەیreverseوە دەتوانین شێوەی ڕەنگەكە پێچەوانەبكەینەوە كە لەكاتی كرداریدا زیاتر ڕوندەبێتەوە.

٣–style:بەهۆی ئەم فەرمانەوە شێوە و،مۆدێلێك بۆ gradientهەڵدەبژێرین كە بەهۆیangleوە دەتوانین دەستكاری گۆشەكەی بكەین.

٤–scale:بەهۆیەوە دیاری دەكەین كەئایا چەندی وێنەكە بگرێتەوە ،واتە چەند لەحەجمەكەی داگیربكات،كەبەڕێژەی لەسەد دا دیاری دەكەین.

@@@@

–...pattern overlay:ئەم فەرمانەش لەسەر هەمان نمونەی پێشو ڕوندەكەینەوە ،بەكلیككردن لەسەر چینی گوڵەكە لەپەنجەرەی چینەكەدا،پاشان كلیككردن لەسەرئەم فەرمانەكەپێكهاتووەلە:

+ blend modeوopacityوەك لەپێشتردا باسكراوە.

+هەڵبژاردنی patternێك ،و دیاریكردنیscaleوەك پێشترباسكراوە.

سەرنج:

نابێت ڕێژەی blend modeسفربێت ،ئەگەر سفربێت ئەوا گۆڕانی patternلەسەر وێنەكە دیاری نادات.

+okوcancelوnew styleوpreviewلەپێشترباسكراوە.



@@@@

stroke–:ئەم فەرمانە شێوەیەکی گرنگە کەبۆ مەبەستی ڕەنگکردن بەکاردەهێنرێت و،جێگەی بایەخ پێدانە،هەربۆیە بەنموونەیەك زیاتر ڕونی دەکەینەوە.ئەگەر دۆکۆمێنتێکی نوێ بکەینەوەو،لەنێویدا بنوسین،وەك من لێرەدا نوسیومە(سەنتەری زانیاری تەکنیکی کوردی هێمن) و،پاشان ئەم فەرمانەی بەسەردا جێبەجێبکەین ئەوا دەتوانین بەهۆی ئەم فەرمانەوە هێڵی گۆڕاو بەگوێری پیتەکانی نوسینەکە بەچواردەوری نوسینەکەدا بکێشین کەدەتوانین بەتەواوی دەستی بەسەردابگرین و،گۆڕانی پێویستی تیائەنجامبدەین ،بەم شێوەیە:

١–size:بەهۆی ئەم فەرمانەوە حەجمەکەی دیاری دەکەین.

٢–position:واتە شێوەکەی دیاری دەکەین،بەمانایەکیتر واتە شوێنەکەی کەمیش سێ هەڵبژاردنی داوە:

+outside:واتە لەدەرەوە.

+inside:لەدەرەوە.

+center:لەناوەڕاست و،چەقەکەیدا.

٣–لە mode وblend وopacityدا شێوە و،ڕێژەیەکی دیاری کراو هەڵدەبژێرین،کەبەهۆیەوەدەتوانین تۆخ یان کاڵی بکەین ،بەڵام بەڕێژەی٪٠٠هیچ دەرناکەوێت واتە پێویستە سفرنەبێت.

٤–دەتوانین لەfill typeدا شێوەیەك دیاریبکەین بۆ کارەکەمان کەئایا تەنها ڕنگبێت colorیان gradientیانpatternکەلەپێشتردا باسیانکراوە .وەئەگەر colorمان هەڵبژارد ئەوا دەتوانین لە چوار گۆشەکەی ژێریدا ڕەنگەکەبگۆڕین.

لەکۆتایداokی دەکەین،یانcancelدەکەین ولەکارەکەمان پاشگەزدەبینەوە.وە دەشتوانین مۆدێلێکی نوێ new styleدروستبکەین وەك لەپێشتر باسکراوە،وە بەکلیك کردن لەناو چوار گۆشەی بەردەمpreviewدەتوانین ڕاستەو ،خۆو بەرلەokی کردن گۆڕانەکە ببینین.



٦–**new fill layer**:ئەم فەرمانە سیٚ فەرمانی دیکەی لێجیادەبێتە کە ئەمانەن:

–solid color:ڕەنگی ڕەق کەکارکردن تیایدا سانایە و،بەکلیککردنی پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە کەلەچەند بەشێك پێکهاتووە و،لەبەشیناوی nameدا ناوێك دەنووسین و،دەتوانین بەکلیککردنیچوارگۆشەیبەردەم use previous layer to create clipping mask بەشی




ماسکینی tool boxچالاك بکەین وە لەبەشیcolorدا ڕەنگێك هەڵبژێرین و،لە بەشیmodeدا شێوەکەی ولەبەشی opacityدا حەجمەکەی دیاری بکەین.

سەرنج: بۆ ئەوەی کارەکەمان تەنها لەسەر نووسینەکە ئەنجام بدەین وەك نمونەکەی پێشو دەبێت لەبەشی colorدا ڕەنگێك هەڵبژێرینواتەnoneنەبێت.ئەگەرنا هەموو وێنەکە(پەنجەرەکە)دەگرێتەوەکەلەسەر شاشەکەیەو،چالاکەوکاری تیادەکەین لەجێگەی نوسینەکە.

لەکۆتاییدا okی دەکەین،یان cancelدەکەین و،لەکارەکەمان پاشگەزدەبینەوە.

–gradient...:بەکلیککردنی پەنجەرەیەکی وەك ئەوەی پێشترsolid colorمان بۆ دەکاتەوە کەکاردن لەسەری هیچ گۆڕانێکی تیانیەو،بەپێویستی نازانم دووبارە باسیبکەم،هەروەها دوایokیکردن پەنجەرەی ...gradientدەکرێتەوە کە لەپێشتر باسکراوە.

–... pattern:وەك خاڵی gradientوایە.



*********

٧-new adjustment layer:ئەم بەشەش لەچەند بەشێك پێكهاتووە كەپێویست بەباسكردنیان ناكات چونكە بەكاربەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ لیستیimage،بەشیadjustmentكەبە وردی و،بەنموونەوە باسمان كردون.




********

٨=change layer content:ئەم فەرمانەش لەچەند بەشێك پێكهاتووە كە لەلیستێكی تەنیشتیدا دەردەكەوێت و،لەكاتێكدا چالاك دەبێت كەئەگەر پەرەیەكی نوێمان كردبێتەوە و،چەند لەیەر(چین)ێكمان تیادانابێت ،ئەوا بەدیاری كردنی یەكە یەكەی چینەكان دەتوانین گۆڕانیان تیا ئەنجامبدەین بە هۆی فەرمانەكانەوە كەبێگومانە هەموو فەرمانەكان بەوردی لەپێشتردا باسكراوە و،پێویست بەدووبارەكردنەوە ناكات بۆ ئەوەی شوێن نەگرێت.

+بۆ زانینی فەرمانەكانی solid color وgradient وpatternبڕوانە فەرمانی ٦واتە new fill layerكەلە هەمان لیستی ئێستا،واتەlayerدایە.

+بۆ زانینی بەشەكانی تری ئەم لیستە بڕوانە فەرمانی adjustmentلە لیستیimageدا كەبەوردی باسكراوە.

*******

٩-layer content option...:ئەم فەرمانە لەهەندێك كاتدا چالاك دەبێت وەك لەدوای ئەنجامدانی فەرمانیlayer>type>covert to shape وەك لەنموونەكەدا دواتر ڕونی دەكەینەوە ،كە دەتوانین بەهۆی ئەم فەرمانەوە ڕەنگی ناو نوسینەكە بگۆڕین بەو ڕەنگەی كەخۆمان دەمانەوێت

کەبەکلیککردن لەسەری پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە کەپێکهاتووە لەچەند بەشێك کەلەبەر سادەی بەوردی باسیناکەین چونکە وەك پەنجەرەی هەڵبژاردنی ڕەنگ وایە بێجودای.

سەرنج:دەبێت ئەو بەشەی ئەم فەرمانەی تیائەنجامدەدەین لەبەشیlayerولەپەنجەرەی تەنیشتیدا هەڵی بژێرین بەکلیککردن لەسەری .

******

**١٠-type**:مەبەست لەجۆرە و،چەند گۆڕانێکی گرنگی پێئەنجامدەدرێت ،کەبەوردی هەریەکەیان باسدەکەین،بەمشێوەیە:

+create work path:ئەم فەرمانە دەبێتەهۆی دروستبوونی وێنەیەك بۆ وێنەکەی کردوومانەتەوە ،کەدەتوانین بەهۆی فەرمانی moveوە بەشە بنچینەییەکە بجوڵێنین و،بەمەش بەشە(وێنە)نوێیەکە لەجێگەی خۆی دەمێنێتەوە،وە دەتوانین ئەم فەرمانە بەڕونی لە سەر نوسینی(سەنتەری زانیاری تەکنیکی هێمن)لەنمونەکەی پێشودا ئەنجامبدەین و،دەرئەنجامەکەشی ببینین.




+convert to shape:ئەم فەرمانەوەك فەرمانیcreate work path پێشووەوایە ،بەڵام لەوەدا جیاوازە کەناتوانین بەشە نوێیەکە بەهۆی فەرمانیmoveوە بگوێزینەوە.

+horizontal:ئەم فەرمانە نوسینەکەمان دەکاتە شێوەیەکی ئاسۆی.

+vertical:ئەم فەرمانە نوسینەکەمان بۆ دەکاتە نوسینێکی شاوڵی ،کەبەکلیککردن لەسەری پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە کەدەتوانین بەهۆیەوە گۆڕانەکە ئەنجامبدەین وokی بکەین یان پەشیمان ببینەوەو noهەڵبژێرین.

+فەرمانەکانی anti-aliasهەریەکەو گۆڕانێك لەشێوەی نووسینەکەدا ئەنجامدەدات کە بۆمەبەستی جوانتر کردنی کارەکەمانە .

+covert to point textئەم فەرمانە بەکلیککردنی دەگۆڕێت بۆ covert to paragraph textواتە لەخاڵێکەوە فەرمانەکە بەسەر هەموو پەرەگرافەکەدا دەسەپیَو جێبەجێدەبێت.

+text warp:بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین شێوەیەکی دیاری کراوی خۆی کەلەبەرنامەکەدا ئامادەکراوە،تابەتیشە بەنوسین ،بدەین بەو نوسینەکەهەمانە ئەویش بەهەڵبژاردنی شێوەکە دەبێت لەبەشیstyleدا کەلەچەند شێوەیەك پێکهاتووە وەك ئالأflagیان تاجarchی پاشای و،هەروەها شتی دیکە .وەلەبەشی horizontalوverticalدا دیاری دەکەین کەئایا ئاسۆی بێت ،یان ستونی،بەهۆی کلیککردن لەناو بازنەی یەکێك لەفەرمانەکان.وەهەروەها بەهۆی فەرمانەکانی bendو horizontal distortionو distortion vertical وە دەتوانین گۆڕان لەشێوە هەڵبژێردراوەکەی بەشی styleدا بکەین بەگوێرەی پێویست و،خواستی خۆمان بۆ جوانتر کردنی نوسینەکەمان.




******

**١١-rasterize:ئەم فەرمانەش وەك هەرفەرمانێکی تر لەچەند بەشێك پێکهاتووە**

+type:بەکلیك کردن لەسەر ئەم فەرمانە ئەو بەشەی چینەکە کەپێشتر لەپەنجەرەی تەنیشتی لەیەردا شێوەیەکی دیاری کراوی هەبووە دەبێتە شەفاف.

+دەتوانین بلێین فەرمانەکانی ئەم بەشە زۆر جێگەی بایەخ نی یە و،بەتێکرای هاو فەرمانن و،لەیەکترەوە نزیکەکارکردنیان.



*****

**١٢-new layer based slice**:بەهۆی ئەم فەرمانەوە شێوە دیاریکردنی ئەندازەی ئەنجامدەدرێت.




*******

**١٣-add layer mask**:خستنە سەری چینی شاردەرەوەکە پێکهاتووەلە:

+ reveal all:داپۆشینی هەمووی ئەنجامدەدات کە بەکلیککردن لەسەری چالاك دەبێت وەدەتوانین بەهۆی هەمان فەرمانیشەوە پەشیمان ببینەوە لەکارەکەمان کەبەئەنجامدانی ئەم فەرمانە فەرمانە بنچینەییەکە دەگۆڕێت بۆ remove layer maskواتە لابردنی چینی شاردەرەوە کە بەکلیککردن لەسەرdiscardدەبێت .وە ئەم فەرمانە لەسەر وێنەکەی بەردەممان بەدیار ناکەوێت ،بەڵکو تەنها لە ناو پەنجەرەی تەنیشتی دا دەیبینین.

+hide all:واتە شاردنەوەی هەمووی کەوەك فەرمانی پێشوو وەو ،تەنها جیاوازی ئەوەیە کە دیارنەمانەکە لەسەر وێنەکەی بەردەمیشمان(واتە نووسراوی وێنەی چالاکی سەر شاشەکە)ڕوودەدات.



******

**١٤-enable layer mask:واتە تواناى دا پۆشینى چینى هەیە و،ئەمەش لەگەڵ فەرمانى پێشترچالاك دەبێت و بەكلیككردنى دەگۆڕێت بۆdisable layer maskواتە تواناى داپۆشینى چینى نابێت و،فەرمانى پێشو لەچالاكى دەوەستێت بەهۆى ئەم فەرمانەوە.**

************

**١٥-delete vector mask:بەكاردەهێنرێت بۆ سڕینەوە و،لابردنى ماسكەكە دواى ئەنجامدانى فەرمانى ماسكەكە دەگۆڕێت بۆ ئەم فەرمانى سڕینەوەیە ئەگەرنا لەسەرەتادا بەهەمان شێوەى فەرمانى add layer maskو پێكهاتووەلەadd vector maskودووبەشى هەیە وەك فەرمانى پێشوو.**




*******

**١٦- enable vector maskوdisable vector mask:وەك فەرمانى خاڵى ١٤ وایەو،بەئەنجامدانى فەرمانى ١٥چالاك دەبێت.**

*******

**١٧-create clipping mask: - ئەم فەرمانە لەكاتێكدا چالاك دەبێت، كە وێنەیەكى كراوەمان هەبێت لەسەرشاشەكە ،كەلەچەند بەشێك(چینێك) پێكهاتبێت و،چینێك لەچینەكان چالاك بێت بەمەرجێك چینى باكگراوەند نەبێت ،كەبەهۆیەوە ماسكێك دروستدەكەین.بەنمونە ئەگەرئەم**

فەرمانە بەسەر وێنەکە بەردەستماندا جێبەجێبکەین و،چینی نوسینەکە چالاك بکەین ئەوا لە وێنەکەدا نوسینەکە ماسك دەبێت و،دەشاردرێتەوەو،دیاری نامێنێت.




*******

١٨-**release clipping mask**:بۆ پەشیمان بونەوەیە لە فەرمانی پێشووی خاڵی ١٧.

*******

١٩-**arrange**:ئەم فەرمانە لەچەند بەشێکی تر پێکهاتووە،کەهەریەکەو گرنگی تایبەتی خۆی هەیە،وبەجیا باسیان دەکەین و،لەسەر نمونەکەی پێشو رونی دەکەینەوە بەم شێوەیە:

+bring to front:بەهۆی ئەم فەرمانەوە چینی دیاری کراو لەپەنجەرەی چینەکاندا دەکەوێتەبەردەم چینێکی ترو ،دەبێت بە چینی یەکەم لە پەنجەرەی layerدا.




+bring forward: بۆ ناردنی بەشی هەڵبژێردراو،و سەلێکت کراو ،بۆپێشەوە.

+send backward:ناردنی چینی هەڵبژێردراو،لەپەنجەرەی لەیەردا بەئاراستەی دوواوە.

+send to back:ناردنی چینی سەلێکتکراوی پەنجەرەی لەیەر بۆ دوواوە .

******

**٢٠-align to selection:** ئەم فەرمانە لەچەند بەشێك پێكهاتووە ،كەدەتوانین لەسەر بەشێكی سەڵێكت كراوی نوسینێك جێبەجێی بكەین و،بەم شێوەیە فەرمانەكە بەپێی بەشەكان دەردەكەوێت:

+to edge:بە ئەنجامدانی ئەم فەرمانە بەشەسەلێكتكراوەكە دەگوێزرێتەوە بۆ خوارو ،شێوەی سەلێكتەكە لەشوێنی خۆیدادەمێنێتەوە.

+vertical center:لە سێنتەرەوە فەرمانەكە ئەنجامدەدات.

+bottom edges:بەئاڕاستەی سەرەوە فەرمانەكە ئەنجامدەدرێت.

+left edge:بەئاڕاستەی چەپدادەبێت .

+horizontal center:بەرەو سێنتەری ئاسۆی فەرمانەكە ئەنجامدەدرێت.

+right edge:بەئاڕاستەی لای ڕاست دەبێت.



******

**٢١-distribute linked:**ئەم فەرمانە زۆر جێگەی بایەخ نییە

*******

**٢٢-lock all layer in set...:**ئەم فەرمانە بەكار دەهێنرێت بۆ قوفڵكردنی هەموو چینەكان ،كە دوای ئەوە ناتوانین تەحەكومی پێوەبكەین و،دەستكاری بكەین.

*******

**٢٣-merge down:**بەهۆی ئەم فەرمانەوە چینی چالاك و،سەلێكتكراو لەناو پەنجەرەی تەنیشتی چینەكاندا لەگەڵ چینی دوای خۆی دەبێت بەیەك.

********

٢٤–merge visible:چینەکان هەموویان دەبن بەیەك و،لەپەنجەرەی چینەکاندا بەشێوەی وێنەی سەرشاشەکە دەبینرێت ،نەك بەچەند چینێك.




*********

٢٥–flatten image:بەهۆیەوە وێنەکە تەخت دەبێت و،وەك فەرمانی پێشو بەشێوەی یەك چین دەردەکەوێت لەناو پەنجەرەی چینەکاندا .



## ➢ ليستى هەڵبژاردن select



١–all:ئەم فەرمانە بەکادێت بۆ سەلێکت کردن و،هەڵبژاردنی هەموو وێنەکە.




********

٢–deselect:ئەم فەرمانە بەکاردەهێنرێت بۆ پاشگەزبونەوە لە فەرمانی سەلێکتکردن،واتە سەلێکتی سەروێنەکە لادەبات و،دەیسرێتەوە.

*******

٣–reselect:واتە دوبارە سەلێکتکردنەوە،و بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین لەفەرمانەکەی خاڵی پێشووdeslectپەشیمان ببینەوە و،دووبترە وێنەکە بگێرینەوە بۆ بارەسەلێکتکراوەکەی پێشوو.

*******

٤–inverse:بۆ ڕەتکردنەوەی فەرمانی سەلێکتکردنەکەیە.

******

٥–color range...:واتە ماوەی نێوان ڕەنگەکان،کە بەپێی پێویست بەکاردەهێنرێ و،گرنگی خۆی هەیەو،بەکلیککردنی دایەلۆگ بۆکسێك دەکرێتەوە کەپێکهاتووە لەچەند بەشێك بەم شێوەیە:

+select:لەم بەشەدا ڕەنگێك هەڵدەبژێرین کەبەشێك بێت لەوێنە کراوەکەی بەر دەستمان ئەوا دەبینین ئەو ڕەنگەی هەڵمان بژارد بەتەنهای لەناو پەنجەرەکەدا پیشان دەدەت ،بەلام بەمەرجێك

لەدوو ئیختیاریimageو selectionدا selectionهەڵبژێرین.بەڵام ئەگەر sampled colorمان هەڵبژارد بەهۆی هەرسێ ئامێرەکەی ژێر save–وە دەستکاری دەکەین،کە ئەوەیان زائیدەکەی لەبەردەمدایە بۆ زیادکردنەو،ئەوەی ناقسەکەی لەبەردەمدایە بۆ کەمکردنە و،ئەوەی هیچی لەبەردەم نیيە ئاساییەو،پیی زیاد و،کەمیش دەکرێت.

+fuzziness:ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ زیاد کردن و،کەمکردنی ڕێژەی پیشاندانەکەو لەکاتێکدا چالاك دەبێت کە sampled colorهەڵبژێرین،هەروەها سێ‌قەڵەمەکەی ژێرsaveیش .

+..selection preview:واتەهەڵبژاردنی پیشاندان کە چەند شێوەیەکی هەیەو،بەهۆیەوە چۆنی یەتی پیشاندانی وێنەکە دەستنیشان دەکەین.

+دەتوانین بەهۆی فەرمانیsaveوە ئەو گۆڕانە خەزن بکەین بۆ وێنەیەکی تر و،بەهۆی فەرمانی..loadلەکاتی پێویستدا بیکەینەوە.

+بە کلیککردن لەناو چوار گۆشەیinvertلەفەرمانەکەمان پەشیمان دەبینەوە کە کردوومانە.

+لەکۆتاییداokی دەکەین ئەگەر ویستمان وەئەگەر نا cancelدەکەین.




*******

٦–...feather:بەکلیك کردنی ئەم فەرمانە دوای ئەوەی وێنەیەکمان سەلێکتکرد پەنجەرەیەکی بچوکمان بۆ دەکرێتەوە کەدەتوانین بەهۆیەوە دیاری بکەین کەهێڵەکانی فەرمانی سەلێکشنەکە چەندا دووربێت لەسەلێکتە گواستراوەکەی کەبەهۆیفەرمانی modifyوە پێش ئەنجامدانی ئەم فەرمانە ئەنجامەمان داوە،واتە دەبێت وێنەکە سەلێکت بکەین بەهۆی فەرمانیall–وە و،پاشان فەرمانی modify>borderدیاری بکەین و،لەپاشاندا و،لەدوای ئەم دوو فەرمانە فەرمانی ...featherدیاریبکەین.




******

**٧–modify...:ئەم فەرمانە پێك هاتووەلە چوار بەشی گرنگ ،ئەوانیش:**

**+...border:ئەم فەرمانە بەکار دەهێنرێت بۆ دورخستنەوەی خەتی دیاری کردنەکە لە قەراغی وێنەکەوە ،کەبەکلیککردنی پەنجەرەیەکی بچوکمان بۆ دەکرێتەوە و،لە لاکێشە بچوکەکەیدا بەخواستی خۆمان ژمارەیەك دەنوسین تا بەبڕی ئەو ژمارەیە گۆڕانەکەمان بۆ بکات و،هێڵەکەمان بۆ دوور بخاتەوە لە قەراغی وێنەکە.**

**+...smooth:بەهۆی ئەم فەرمانەوە ژمارەیەك دەنوسین لەو پەنجەرەیەی بۆ مان دەکرێتەوە تا بەقەدەر ژمارەی دیاری کراو ،دوو هێڵی سەلێکتکردنێکی ترمان بۆ بکێشیٚ لەناو سەلێکتەکەی پێشوودا ،بەلاٚم دەبێت پێشتر فەرمانیborderمان ئەنجامدابێت ،ئەگەرنا ئەم فەرمانە چالاك نابێت،وەدەبێت ئەو ژمارەیەی بۆ گۆڕانەکە دەیدەینیٚ زیاتر بێت لەژمارەی فەرمانی پێشوو .border**

**+..expand:بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین وەك فەرمانی smoothسەلێکتێکیتر لەناو سەلێکتەکەی سەرەتادا بکێشین کە بچوکتربێت لەسەلێکتە بنچینەییەکە و،لەوەشدا لەفەرمانیsmoothجیادەبێتەوە کەسەلێکتە نوێیەکەی بەهۆی ئەم فەرمانەوە کێشراوە هەمان شێوەی سەلێکتە بنچینەیەکەی سەرەتای هەیە ،بەلاٚم لەفەرمانی smoothسوچەکانی سەلێکتە نویٚیەکە گۆشەی نابێت بەلکو شێوە چەماوە دەبێت.وەنابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کەئەم فەرمانەش وەك فەرمانی پێشوو وەهایەو ،دەبێت لەپێشدا فەرمانیborderمان ئەنجام دابێت ئەگەرنا چالاك نابێت.**

**+..contract:تەواو پێچەوانەیفەرمانی پێشووە...expandکە بەهۆی ئەم فەرمانەوە سەلێکتە نوێیەکەی پێشتر کێشاومانە بچوکدەکەینەوە،واتە نزیکی دەخەینەوە لە سەلێکتە بنچینەییەکەی قەراغی وێنەکە.**




***********

٨و٩–growوsimilar:ئەم دوو فەرمانە دووای ئەنجامدانی فەرمانی border چالاك دەبێت بەشێوەیەكی خۆی بەشێكی وێنەكەمان بۆ سەلێكت دەكات كەدەتوانین بیبڕین و بیگوێزینەوە ،یان بیسرینەوە كەبەشێكی دەمێنێتەوە و،وێنەیەكی خەیاڵی درووستدەكات.



*******

١٠-**transform selection**:واتە گواستنەوەی هەڵبژێردراو و،کەبەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین ڕێژەی سەلێکتکردنەکە بگۆڕین و بچوکی بکەینەوە بەخواستی خۆمان ،واتە بەهۆی ئەم فەرمانە وە شەش چوار گۆشەی بچوك لە چوار دەوری سەلێکتەکە دروست دەبێت کەدەتوانین بەهۆیەوە سەیترەی تەواو بەسەر سەلێکتەکەدا بکەین،وەئەگەر چوار گۆشەکان دیار نەبوون ئەوا دەتوانیت بەهۆی فەرمانی جوڵەmoveی tool boxوە ،گواستنەوە ئەنجامبدەین بۆ ئەوەی دەربکەوێت.

*******

١١-**load selection…**:بەکار دێت بۆ کردنەوەی openی بەشێکی سەلێکتی خزنکراوsaveکەپێشتر خەزنمان کردووە و،پاراستومانە ئەگەرنا ئەم فەرمانە چالاك نابێت .

*******

١٢-save selection:ئەم فەرمانە بەکار دێت بۆ هەڵگرتن و،پاراستن و،خەزنکردنی بەشێکی سەلێکتکراو ،کەپاشان بەهۆی فەرمانی load selectionوە دەیکەینەوە و،سودی لێدەبینین.

سەرنج:فێرخوازی هێژا… زانست خوازی خۆشەویست دەتوانی سود لەم فەرمانە وەربگریت بۆ دروستکردنی چوار چێوە بۆ وێنەکەت،کە دووای ئەوەی دوو سەلێکتمان لەناو یەکدا کرد دەتوانین بەینەکەیا بەهۆی فەرمانی سڕینەوەdeleteوە لاببەین بەمەش دەبێتە چوار چێوە کەدەتوانین گۆڕانی دیکەش ئەنجامبدەین.

######################################

# ➢ ليستى فلتەرfilter



**١–...extract:ئەم فەرمانە کەکلیکی دەکەین پەنەرەیەکمان بۆ دەکاتەوە ،کەلەبەر گەورەی پەنجەرەکە و،هەر پەنجەرەیەکی گەورەی دیکەی هاوشێوەش دەکەین دوو بەش و،بەدووجار باسیان دەکەین،بەم شێوەیەدوای ئەوەی کلیکی ئەم فەرمانەمان کرد دایەلۆگ بۆکسێك دەکرێتەوە کەوێنە چالاکەکەی سەرشاشەکەی تێدایەو،دەتوانین گۆڕانی تیادابکەین.**

***لێەدا باسی ئەو چەند دووگمەیە دەکەین کەکەوتۆتەلای چەپ:**

+edge highlighter tool(b):**بەهۆی ئەم فەرمانەوە کەبەکلیککردن لەسەری چالاك دەبێت دەتوانین نووسینێکی تایبەتی ،یان شێوە یەك کە خۆمان دەمانەوێت بیکێشین،کە دەتوانین حەجمەکەی بەهۆی*دووەمە دەستکاری بکەین ،کەدووای باسیدەکەین.**

+fill tool(g):**ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ پێدانی ڕەنگێك بەهەموو وێنەکە،کەبەدووبارە کلیککردنیش فەرمانەکە پێچەوانە دەبێتەوە و،ڕەنگەکەلادەچێت.**

+eraser tool(e):**ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ سڕینەوە و،لابردنی ئەو نووسینەوشتە تایبەتیەی کەلەسەر وێنەکە بەهۆی فەرمانیedge highlighter toolوە کێشاومانە.**

+eyedropper tool:**تولّی قەترەی دلّۆپاندن.**

+cleanup tool(c):**بەکاردێت بەمەبەستی سڕینەوە شتێك بەئاڕاستەی سەرەوە ،وەلەکاتێکدا چالاك دەبێت کەوێنەکە لەباری previewدا بێت.**

+ edge touchup tool(t):**وەك فەرمانی سەرەوە وایە و،بەهۆی فەرمانیpreviewوە چالاك دەبێت ،واتە لەکاتی فەرمانەکەدا.**

+zoom tool (z):**ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ گەورەکردنی وێنەی ناو پەنجەرەکراوەکەی فەرمانە کە.**

+hand tool (h):**ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ بچووککردنەوەی وێنەکە کەبەهۆی فەرمانەکەی پێشووzoomوە گەورەمان کرد.**

***بەشی دووەمی پەنجەرەکە بەشی لای ڕستدەگرێتەوە،کەبەم شێوەیەیە:**

+ok:**لەکۆتایی فەرمانەکەدا ئەگەر ویستمان کلیکی لەسەر دەکەین بەمەش ئەوکارەی کردوومانە لەسەر وێنە کراوە و،چالاکەکەی بەردەستمان دەردەکەوێت.**

+cancel:**ئەگەر نەمان ویست گۆڕانەکە لەسەر وێنە چالاکەکەی سەرشاشەکە دەربکەوێت و،پەشیمان بووینەوە ئەوا کلیکی cancelدەکەین.**

+preview:**واتە پیشاندان و،بەلەوەی okی بکەین دەتوانین کلیکی ئەم فەرمانەبکەین هەتاوەکو ئەنجامی کارەکەمان پیشان بدات ،بۆئەوەی ئەگەر بەدلّمان نەبووcancelبکەین ،یان ئەگەر بەدلّمان بەەokی بکەین.**

✓ **سەرنجــــــ١٠ـــــــ:هەتاوەکو کلیکی چوار گۆشەی بەردەمforce foreground نەکەین فەرمانەکانیokوpreviewچالاك نابێت. وەئەگەر هیچ کارێکیشمان نەکردبێ بەهەمان شێوە فەرمانەکە چالاك نابێت ئەگەرچی کلیکی...forceیش بکەین.**

–tool option**کە ئەم فەرمانانە لەخۆدەگرێت:**

+brush size:بەهۆی ئەم فەرمانەوە حەجمی edge highlight toolدیاری دەکەین.

+highlight/:بەهۆی ئەم فەرمانەوە ڕەنگێك بەخواستی خۆمان هەڵدەبژێرین بۆ فەرمانی پێشووی edge highlight toolەکە.




*******

**٢-filter gallery**:بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین مۆدێلێکی ئامادە کراوی بەرنامەکە ،بدەین بەوێنەکەی بەدەستمان کەبەکلیککردنی شێوەکان ئەنجامدەدرێت ،کەدەتوانینبەهۆی ئەو شێوەسەهمەی هەمان شێوە خۆییەکان بەدیار بخەین ،وەبەهۆی هەمان فەرمانیشەوە دەتوانینلای بەرین و،تەنها وێنەکە ببینین کەئەمەش زایتر بۆمەبەستی جوانتر دەرکەوتنی وێنەکەیە کە قەرە باڵغی پەنجەرەی فەرمانەکە کەمدەکاتەوە ،وەئەگەر کلیکی water paperنەکەین ئەوا شێوە مۆدێلەکەمان پیشان نادات کە چ کاریگەرییەکی دەبێت لەسەر وێنەکە ،واتە previewناکات و،بەرلەokی کردن ناتوانین شێوەکە ببینین.

هەروەها بەهۆی هەڵبژاردنی هەریەکێك لە ستایلەکان لەژێر فەرمانیokیدا ،چەن فەرمانێکمان دەداتێکە دەتوانین بەهۆیەوە گۆڕانی تەواو لەشێوە هەڵبژێردراوەکەدا بکەین و،زیاد یان کەمی بکەینەوەو چۆنێیەتی تەئسیرەکەی بگۆڕین ،وەبەپێی ستایلەکە فەرمانەکانیش دەگۆڕێت.

وە لە کۆتایداokی دەکەین،یان cancel دەکەین و،لەکارەکەمان پەشیمان دەبینەوە.




***************

٣–**liquify...**:ئەم فەرمانەش وەك فەرمانی پێشوو بەدووبەش باسدەکەین بەهۆی گەورەی پەنجەرەی فەرمانەکەوە و،بۆزیاتر ڕونکردنەوەش:

*ئەم بەشەی لەوێنەکەدا دیارە وەکو بەشی یەکەمی پەنجەرەکە دەناسێنین ،کەلەچەند فەرمانێکی گرنگ پێکهاتتوە:

–وێنەی دستەکە forward warp tool(w)فەرمانێکی بلاۆوکردنەوەیەو ،دەتوانین بەکلیککردن لەسەری پاشان بچینەسەر وێنەکەی نێو پەنجەرەکەو،گۆڕان ئەنجامبدەین و،ڕەنگێك بگوێزینەوە بۆ تەنیشتی خۆی ،یان پانی بکەینەوە.

–فەرمانی قەڵەمەکە پێچەوانی فەرمانی پێشووەو،دەتوانین ئەوگۆڕانەی پێشو ڕەتبکەینەوەو،بیگێرینەوە بۆ باری ئاسای پێشووتری وێنەکە.

–هەمو ئەوهێمایانەی دەکەونە دوای فەرمانی قەڵەمەکەوە بۆ دروستکردنی شێوەی تایبەتی بەکاردێت ،کەشێوەتایبەتییەکە وەك وێنەبچوکەکەی فەرمانەکە دەبێت و،دەتوانین دووای ئەوەی کلیکمان کرد لەسەر فەرمانەکە بچینە سەروێنەکەی ناو پەنجەرەکەودەست لەسەرماوسەکەدابگرین و،دەستلانەبەین هەتاوەکو شێوەی پێویست وەردەگرێت وەك لە وێنەی فەرمانەکاندا دیرە.

–وێنەی قەلەمەکەی دوای ئەکۆمەڵە فەرمانە دێت بەمەبەستی ڕەنگکردن بەکاردێت.

–هێمای لاستیکەکە بەکاردێت بۆ سرینەوەی ڕەنگکردنەکەی بەفەرمانەکەی پێشوو ئەنجاممماندا.

–هێمای دەستەکە بەکاردێت بۆ بچووککردنەوەی وێنەکەی ناو پەنجەرەی فەرمانەکە دوای ئەوەی بەهۆی فەرمانی گەورەکردنەوەکە زەڕەبینەکەیەوzoom toolی پێدەوترێت.

*بەشی دووەمی پەنجەرەکە وەك لە وێنەکەدا دیارە،پێکهاتووەلە:

–load mesh...:ئەم فەرمانە بەکاردەهێنرێت بۆکردنەوەی ئەو وێنەیەی کەبەهۆی هەمان پەنجەرەوەو،بەهۆی فەرمانی...save mashوە ،پاراستوومانەو ،خزنمان کردووە.

–tool option:بەشی هەڵبژاردن لەچەند بەشێکی بچوکتر پێکهاتوەلەوانە:

#brush size:دەتوانین بەهۆیەوە حەجمی برەش تولْ زیادو،کەم بکەین بەگوێرەی پێویستی وێنەکەی ناو پەنجەرەی فەرمانەکە.

#brush density:ئەم فەرمانەوەك فەرمانی پێشوو ڕێژەکەی پێزیادو ،کەمدەکەین.

#brush pressure:بەهۆیەوە زەختی برەش توولْ دیاری دەکەین و،زیادو،کەمی دەکەین بەپێی پێویست.

#brush rate:بەهۆیەوە ژمارەی کەڕەتەکانی برەش زیادو کەمدەکەین.

–reconstruct option:ئەم فەرمانەش لەسێ‌بەش پێکهاتووە کەلەکاتێکدا چالاکە،کە کارمان بەیەکێك لەفەرمانەکانی بەشی یەکەمی پەنجەرەکە کردبێت وەك دروستکردنی بازنەیەك،یان شەپۆلێك یان....،بەم شێوەیە:

#mood:بەهۆی ئەم فەرمانەوە شێوەیەك (جۆری فەرمانێك) هەڵدەبژێرین ،کەچۆنی یەتی گێڕاندنەوەی شێوەدروستکراوەکەی بەهۆی بەشی یەکەمی پەنجەرەکەوە دروستمانکردووە دیاری دەکات بۆشێوەی وێنەکە خۆی ،کە فێرخواز خۆی دەتوانێ‌یەك یەك تاقییان بکاتەوە .

#reconstruct:دوای ئەوەی شێوەیەکمان دیاری کرد لە بەشیmoodدا دێین کلیك لەسەر ئەم فەرمانەدەکەین دەبینین بە چەند جار کلیککردن گۆڕان بەسەر شێوە دروستکراوەکەدا دێت وهەنگاو بەهەنگاو دەچێتەوە شوێنی سەرەتای وئاسای وێنەکە خۆی.

#restore all:بەهۆی ئەم فەرمانەوە ئەو شێوەیەی بەهۆی فەرمانەکانی بەشی یەکەمی پەنجەرەکەوە دروستمانکردووە بەیەك جارو،بەکلیککردن لەسەری لادەچێتو،لەسەر وێنەکە نامێنێت.

–mask option:پێکهاتووەلە:

#none:بەهۆی ئەم فەرمانەوە پاشگەز دەبینەوە لەدەپۆشینی وێنەکە هەمووی کەبەهۆی فەرمانیmask allوە دەبێت ،یان لابردن

وسڕینەوەی بەشێکی ماسککراو بەهۆی فەرمانی(freeze mask tool(fوە لەبەشی یەکەی پەنجەرەکەدا.

#invert all:پاشگەز بوونەوە لە گۆڕانەی بەسەر فەرمانی ماسکدا ئەنجاممانداوە ،جالامانبردبێت و،سڕیبێتمانەوە یان دروستمان کردبێت واتە فەرمانی ماسکمان بەکار هێنابێت.

–view option:هەڵبژاردنی پیشاندانەکان،کەسێ‌ بەشی سەرەکی‌یە:

#show image:بەکلیککردن لەناو چوار گۆشەکەی بەردەم ئەم فەرمانە وێنەچالاکەکەی سەرشاشەی بەرنامەکەمان بۆ پیشان دەدات لەناو چوار گۆشەی پەنجەرەی فەرمانیliquifyدا وە بەپێچەوانەوە.

<u>**سەرنج‌ـــــــ١١ـــــــــ:**</u>

ئەگەر کلیك نەکەین لەناو یەکێك لە چوار گۆشەبچوکەکانی show meshیانshow maskئەوا فەرمانی show imageچالاك نابێت.

#show mesh:بەکیك کردن لەناو چوار گۆشەکەی بەردەمیدا چالاك دەبێتە و،دەتوانین بەهۆیەوە هێلێکی بەیانیبخەینەسەر وێنەکە ،کەدەشتوانین گۆڕانی تیا ئەنجامبدەین بەم شێوەیە:

@لە size meshدا قەبارە دیاری دەکەین کەسیٚ هەڵبژاردنی داوە(گەورەlargeوبچوكsmallوناوەند medum).

@لەmesh colorدا ڕەنگی خەتە بەیانی یەکە دیاری دەکەین،کە خۆی چەند ڕەنگێکە ئامادەکراوی تیادایە.

$$لەکۆتای کارەکەماندا okی دەکەین،یانئەگەر بەدڵمان نەبووcancelدەکەین و،لەکارەکەمان پاشگەز دەبینەوە.




**********

٤–pattern maker...:ئەم فەرمانە دوای ئەوەی کلیکی لەسەردەکەین چالاك دەبێت و،دەکرێتەوە کەدەتوانین بەهۆیەوە بەشێکی وێنەچالاکەکەی سەر شاشەکە لەناو پەنجەرەی فەرمانەکەدا سەلێکت بکەین بەهۆی فەرمانی سەلێکتەوە و،پاشان گەورە یان بچوکی بکەینەوە و،دیای بکەین کەبۆمان بکاتە چەند دانەی لێکنەپچراو،و بەشێوەیەك کەدەڵێی ئاوێنەیەو تیشك دەداتەوە،کەبەگشتی بەسادەی بەم جۆرەیە:

*بەشی یەکەمی پەنجەرەکە سیٚفەرمانی تێدایە،ئەوانیش:




–rectangular marquee tool: **بەهۆی ئەم فەرمانەوە دوای ئەوەی کلیکمان لەسەر کرد دەچینە سەر وێنەکەی ناو پەنجەرەی فەرمانەکەو،ئەو بەشەی مەبەستمانەسەلێکتی دەکەین.**

–zoom tool: **بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین وێنەی نێو پەنجەرەی فەرمانەکە گەورە بکەین بەگوێرەی پێویست ،وکارەکەمان.**

–hand tool: **بەهۆی ئەم فەرمانەوە و،بەدەبڵ(دوانە)کلیك کردن لەسەری وێنەکە دەچێتەوە بارە ئاساییەکەی پێشووی خۆی و،ئەو گەورەکردنەی بەهۆی فەرمانەکەی پێشووەوە ئەنجاممانداوە لادەچێت و،نامێنێ.**

***بەشی دووەمی پەنجەرەکە چەند دەستنیشانکردنێکی تیادایە کە دەبێت بۆ ئەنجامدانی کارەکەمان بیزانین بۆ بەشێوەیەکی سادە باسیان دەکەین:**

–ok: **ئەم فەرمانە لەسەرەتادا چالاکنیە و،دوای ئەنجامدانی کارەکەمان چالاك دەبێت ،کەدەتوانین دوای تەواوبوونی کارەکەمان ئەگەر پێمان جوان بوو کلیکی لەسەر بکەین و،بەمەش کارە دروستکراوەکە دەچێتە جێگەی وێنە چالاکەکەی سەر شاشەکە.**

–cancel: **ئەگەر نەمان ویست فەرمانەکە جێبەجێبکەین ئەوا کلیکی ئەم فەرمانەدەکەین.**

–generate again: **ئەم فەرمانە دوای دیاری کردنی بەشەکانی** tile generation **کلیکی لەسەر دەکرێت کە بەپێی دیاری کردنی بەشەکان گۆڕانەکە ئەنجامدەدات.**

## سەرنجـــــــــــ١٢ـــــــــــــ:

ئەگەر بەشێکی وێنەکەمان سەلێکت نەکردبێت ئەوا ئەم فەرمانە چالاك نابێت.

–tile generation:ئەم فەرمانە پێکهاتووەلە:




#use image size:بەکلیککردن لەسەر ئەم دووگمەیە بەشێوەیەکی حۆی بەرنامەکی حەجمی وێنەکەمان بۆ هەڵدەبژێرێت و،دیاری دەکات بۆ گۆڕانەکەی دەمانەوێت.

#خۆمان دەتوانین بەهۆی فەرمانیwidthوە پانی و،بەهۆیheightوە بەرزی دیاری بکەین.

#بۆهۆیoffsetوە دیاری دەکەین کەشێوەکەی دەمانەوێت ئاسۆیhorizontalبێت،یان ستونیvertical.

#فەرمانیsmoothnessسێحاڵەتی١و٢و٣ ی‌هەیەو،فەرمانیsample detailیش حاڵتی گۆڕانەکان یەك یەك تۆماردەکات.

–preview:پێکهاتوەلە:

#show:ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ دووبارە نیشاندانەوەی بەشەسەلێکتکراوەکەی دەمانەوێت گۆڕانی تیا ئەنجامبدەین بەهەڵبژاردنیoriginal.

#tile boundaries:دەتوانین بەهۆی ئەم فەرمانەوە ڕەنگێك دیاری بکەین بۆ جیاکردنەوەی بەشە چەندجارە بووەکانی پێشتر سەلێکتمان کردووە و،گۆڕانمان تیائەنجامداوە.

–tile history:پێکهاتووەلە:

#update pattern preview:دەتوانین کلیك لەنلو چوار گۆشەکەی بەردەمیدا بکەین بۆ نوێکردنەوەی پیشاندان.

#بەشەکانی کۆتای پەنجەرەکە پێکهاتووەلە:

@saves preset pattern:کەهێمای فلۆپیەکەو دەتوانین بۆ خەزنکردن سودی لێوەربگرین ،وەك خزنکردنیفایلەو جیاوازیذی‌یە.

@first tile:ئەم فەرمانە دەمانباتەوە سەر یەکەم گۆڕانکاری کەکردومانە.

@previous tile:بەکاردێت بۆ پیشاندانەوەی گۆڕانی پێشتر .

@لاکێشەسپی‌یەکە بۆ ئەوەیە بزانین گۆڕانی چەند چالاکە لەکوێ گۆڕانەکانواتە١٢of١یان....

@next tile:بەکلیککردنی گۆرانی دوای ئەو گۆڕانەمان پیشاندەدات کە هەنووکە چالاکە.

@last tile:بەکلیککردنی دواگۆڕانمان پیشاندەدات.

@delete tile from history:بەکاردێت بۆ سڕینەوەی گۆڕانی چالاک لەناو tile historyدا.

**سەرنجـــــــــ١٣ـــــــــ:**

زۆربەی فەرمانە سەرەکی یەکانی فەرمانیtile historyلەکاتێکدا چالاکە کە زیاتر لەگۆڕانێکمان ئەنجامدابێت.




******

٥-artistic:ئەم فەرمانە کۆمەڵێك فەرمانی لێدەبێتەوە بەشێوەی لیستێك کەئەم فەرمانانەن:(colored pencilوcutoutوbrush dryوgrain filmوfrescoو neon glowو....)کەبەکارهێنانیان تاڕادەیەك وەکو یەکە و،جیاوازی یەکی کەمیان هەیە بۆ بەپێویستی نازانم یەك یەك باسیان بکەم،هەربۆیە تەنها colored pencilباسدەکەم:

-کاتێك کلیك لەسەر فەرمانەکە دەکەین پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە کەلەبەشی لای چەپیدا وێنەچالاکەکەی سەرشاشەکەی تیادایە کەپێشتر کردوومانەتەوە ،واتە دەبێت بەرلەئەنجامدانی ئەم فەرمانە وێنەیەکمان کردبێتەوە و،شاشەکەمان چالاك کردبێت بۆ فەرمانەکە،وە لەژێروێنەکەدا ئەم فەرمانانەهەیە: &نیشانەیەکی زائید(کۆ)کەبۆ گەورەکردنی وێنەی ناو پەنجەرەی فەرمانەکە بەکاردێت.

&ڕێژەیەکی لەسەدا(٪ )کەبەکلیککردنی لیستێك دەکرێتەوەو ،دەتوانین بەهۆیەوە گۆڕان لە حەجمی وێنەی ناو پەنجەرەی فەرمانەکەدا بکەین ،کەلەبەر گرنگ نەبەنیان باسیان ناکەین ،و تۆی زانستخوازی خۆشەویست دەتوانیت بیّ هیچ ترس و،دوودڵییەك تاقییان بکەیتەوە.

–بەشی گرنگی پەنجەرەکە بەشی دووەمییەتی کەدەتوانین بەهۆیەوە گۆڕانەکان ئەنجامبدەین ،بەمشێوەیە:

#ok:دوای ئەنجامدانی گۆڕانەکە کلیکی لەسەر دەکەین.

#cancel:ئەگەی ویستمان لەفەرمانەکە پەشیمان ببینەوە و،بەدڵمان نەبوو کلیکی ئەم فەرمانە دەکەین.

#دەتوانین کلیك لەسەر ئەو لاکێشەیەبکەین کەناوی فەرمانی چالاکی تیا نووسراوە کە لێرەداcolored pencilو ،فەرمانێکی تر لەفەرمانەکانی لیستی فەرمانیartisticهەڵبژێرین ،وەك چۆن دەتوانین ئەم کارە بهۆی کلیککردنی وێنەکانی فەرمانەکانەوە ئەنجامبدەین کەدەکەونە نێوان ئەم دوو بەشەی پەنجەرەکەوەو ،بەکلیککردنی ئەو سەهمەی کەوتۆتە ئەم بەشەی(بەشی دووەم)ی پەنجەرەکەوە دەتوانین وێنەی فەرمانەکان لابەرین ،یان بیان هێنینەوە،واتە دەتوانین بەشی سیٚهەمی پەنجەرەکە کەدەکەوێتە نێوان ئەم دوو بەشەوە لاببەین ،یان بیهێنینەوە.

#بەهۆی ئەو فەرمانانەی دەکەونە ژێر ناوی فەرمانە سەرەکی یەکەوە کەلێرەداcolored pencilو فەرمانەکانی ژێریشی بریتین لە:( پانی pencil widthو ،زەختstroke pressureوڕووناکی پەڕەکە paper brightness )وە دەستکاری شێوە ئامادەکراوەکەی فەرمانی colored pencil بکەین.

#لەبەردەم ناوی فەرمانەکەداpencil coloredلاکێشەیەك هەیەکەبە کلیککردنی ئەو گۆڕانەمان نیشان دەدات کە فەرمانەکە بەسەر وێنەکەیدا دەهێنێت.

#new effect layer:بە کلیککردنی کاریگەری نویٚی چینێك دەردەکەوێت.

#delete effect layer:بەکلیککردنی کاریگەری چینەکە دەسڕێتەوە.



************

**blur-٦**:ئەم فەرمانی لێڵی یە  پێکهاتووەلە:

**#average**:فەرمانێکی خۆییەو ،بەکلیککردنی ڕاستەو خۆ گۆڕان ئەنجامدەدات و،وێنەکە بەڕەنگ دادەپۆشێت.ئەمە ئەگەر بەشێکی وێنەکە سەلێکتنەکەین بەلاًم ئەگەر سەلێکتمانکرد ئەوا تەنها بەشەسەلێکتکراوەکە گۆڕانی بەسەردا دێت.

@@@@

**#blur**:ئەمیش فەرمانێکی خۆییە.

@@@@

**#more blur**:فەرمانی پێشووە بەلاًم بەشێوەیەکی زیاتر.

@@@@

**#Gaussian blur**:ئەم فەرمانە سودی زۆرەو ئەگەر بەشێکی وێنەیەك سەلێکت بکەین پاشان ،کلیك لەسەر ئەم فەرمانە بکەین ئەوا پەنجەرەیەکمان بۆ دەکاتەوە کەتیایدا وێنە چالاکەکەی تێدایە کە بەشێکیمان سەلێکنکردبوو وە بەشە سەلێکتکراوەکە تیایدا بەڕەنگێکداپۆشراوە کەدەتوانین بەهۆی ئەم فەرمانەوە گۆڕانی تیابکەین بەم شێوەیە:




$ بەهۆی هەردوو هێمای زائید وناقسەکەوە(+و-)دەتوانین بەکلیککردنیان وێنەکە گەورەیان بچوکبکەینەوە.

$ بەهۆی فەرمانیradiusوە ڕێژەی دەرکەوتنی بەشە سەلێکترکراوەکە دیاری دەکەین کەتا زیاتر بێت تۆخترە و،کەمتر دەردەکەوێت وەتا کەمتر بێت زیاتر دەردەکەوێت و،کاڵتر دەبێت.

$ بەکلیکی چوار گۆشەی بەردەم لەناوpreview پەنجەرەی فەرمانەکەدا و،بەرلەکلیککردن گۆڕانەکەمان پیشاندەدات.

$ لەکۆتایداokی دەکەین ئەگەر مەبەستمان بوو وە ئەگەرناcancelدەکەین.

@@@@

#lens blur:تا ڕادەیەك وەك فەرمانەکەی پێشوو وایە.

@@@@

#motion blur: ئەم فەرمانە پێکهاتووەلە:

$ ok: دوای ئەوەی گۆڕانمان ئەنجامدا لەگۆشەو ،دووورونزیکیدا کلیکی لەسەر دەکەین ئەگەر ویستمان.

$ cancel:لەکاتێکدا کلیکی لەسەر دەکەین کە ئەگەر نەمانەوێت فەرمانەکە جێبەجێبکەین.

$ بەکلیککردن لەناو چوار گۆشەی previewدا گۆڕانەکانمان پیشاندەدا بەرلەokی کردنیش.

$ هەردوو هێمای(+) و(−) بەکار دەهێنرێت بۆ گەرەکردن وبچوککردنەوەی وێنەکەی ناو پەنجەرەی فەرمانەکە.

Angle:واتە گۆشە، کەدەتوانین بەهۆیەوە گۆشەی وێنەکە بگۆڕین و،زیاد وکەمی بکەینەوە ،بەنووسینی ئەو ژمارەیەی مەبەستمانە لەناو لاکێشەکەی بەر دەم فەرمانەکە،یان دەتوانین ئەم کارە لەڕێگەی ماو سەکەوە ئەنجامبدەین بەگۆڕینی گۆشەی سەر بازنەکە .

$ distance: دوای دیاری کردنی گۆشەکە بەهۆی ئەم فەرمانەوە بەپێی گۆشەکە گۆڕان ئەنجامدەدەین.



**#radial blur**:ئەم بەشەی فەرمانی لێڵی لەسێ بەشی سەرەکە پێکهاتووە کەهەر بەشەیان بەشێ تری لێدەبێتەوە /بەم شێوەیە:

$ amount:واتە کەمێیە،کەبەهۆیەوە کەمێیەی لێیەکە دیاری دەکەین.

$ blur method: ئەم بەشە لەدوو بەشی بچوکتر پێکهاتووە:

@spin:بۆناوەوە،دووە.

@zoom: بۆ پێشەوە،دەرەوە.

$ quality: چۆنێیەتی کارەکەمان دەگرێتەوەکە پێکهاتووەلە سێ شێوە(draftو good واتە باش وەbestواتە باشترین.

$ blur center: واتە چەقی لێڵی کەبەدیاری کردنی بەشەکانی پیشتر لێرەوە کاریگەرییەکەی دەبینین بەرلەokی کردن.

$ okئەگەر ویستمان ومەبەستمان بوو گۆڕانەکەبخاتە سەر وێنەکە کلیکی لەسەر دەکەین.

$ cancel: ئەگەر ویستمان لەکارەکەمان پەشیمان ببینەوەو ،ئەنجامی نەدەین.




@@@

**#smart blur**: لێڵییەکی کۆك ،کەبەکلیککردنی ئەم پەنجەرەیەمان بۆ دەکرێتەوە کەلەچەند شتێك پێکهاتووە،بەم شێوەیە:

$ هێماکانی(+)و (−) بۆگەورەکردن وبچووککردنەوەی وێنەکە بەکار دەهێنرێت لەناو پەنجەرەی فەرمانەکەدا.

$ radius:بەهۆیەوە تیشکەکە دیاری دەکەین.

$ threshold:بەهۆیەوە دەروازەی کارکەمان دیاری دەکەین.

$ quality: کە سێبەشە:

@ low: واتە نزم.

@medium: واتە ناوەند.

@height: واتە بەرز.

$ mode: کەپێکهاتووەلە:(normal وoverlay edge وedge only)

$ ok: لەکۆتای کارەکەدا کلیکی لەسەر دەکەین ،

$ cancel: ئەگەر ئەمان ویست گۆڕانەکەمان بۆ بخاتە سەر وێنەکە و،ویستمان لە فەرمانەکە پەشیمان ببینەوە.




*******

**٧–brush strokes**:ئەم فەر مانە بەهەمان شێوەی فەرمانیartisticبەکار دەهێنرێت بۆ یەبەپێویستم نەزانی کاتی تۆی فێرخوازی پێوە بەفیرۆبدەم ودووبارەی بکەمەوە.



*******

**distort-٨**:ئەم فەرمانە چەند فەرمانێکیتری لێدەبێتەوە بەشێوەی لیستێك کەئەمانەن:

**diffuse glow***:مەبەست لە پەخشبوونەوەودرەوشانەوەی ڕەنگە،کەبەکار هێنانەکەی وەکوو فەرمانەکانی پێشوو وایەو ،فێرخواز بەتاقیکردنەوەی خۆی و،سەرنجدانی ورد دەتوانی گۆڕانەکان هەست پێبکات و،فێریان ببێت،بۆ بەکار هێنانی شێوەی بەکار هێنانی فەرمانی artistic بخوێنەرەوە.

@@@@

**displaced***:بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین نووسینێك یان بابەتێك بهێنین و،بیخەینەسەر وێنەچالاکەکەی سەر شاشەکەو بەردەممان.

@@@@

**glass*و ocean ripple**:بەکار هێنانیان وەکو فەرمانەکانی artisticوایە بێجیاوازی کە فێرخواز دەتوانیٚ خۆی نمونە تاقیبکاتەوە.

@@@@

**pinch***: بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین وێنەکەی هەمانە ،یان بەشێکی سەلێکتکراوی وێنەکە قۆقزبکەین بەرەو دەرەوە یان بەرەو ناوەوەی بەرین ،وەك لەنموونەی پەنجەرەی فەرمانەکەدا دیارە ،بەم شێوەیە:

-(-)و(+) بۆ بچووککردنەوەو گەورەکردنی وێنەکە بەکار دەهێنرێت لەناو پەنجەرەی فەرمانەکەدا.

-amount:بەهۆیەوە کەمىيەی قۆقزبوون یان بردنەناوەوەی وێنەکە دیاری دەکەین،کەبەزیاد کردنی ڕێژەی لەسەدای ناو لاکێشەکە بەهۆی ئەم کەمىيەیەوەوێنەکە بەرەو ناوەوە دەچێت وەبەپێچەوانەشەوە.

-ok:لەکۆتایدا کە کەمی یەکەمان دیاریکرد کلیکی لەسەر دەکەین.

-cancel:ئەگەنەمان ویست گۆڕانەکە بخەینە سەر وێنەکەو پەشیمان ببینەوە لەفەرمانەکە کلیکی لەسەردەکەین.



***polar coordinates**:ئەم فەرمانەش وەك فەرمانی پێشوولە پێکهاتەکەی پەنجەرەکەیداو،تەنها دوو بکارهێنانی هەیە بۆ خڕکردنەوەی وێنە چالاکەکە ی سەر شاشەکە ،بەم شێوەیە:

–(+)و(–): بۆگەورەکردن وبچووککردنەوە وێنەکەی ناو فەرمانەکە.

–rectangular to polar:وێنەکە خڕدەکاتەوە بەرەو ئاراستەی خوارەوەو ،بەکلیککردن لەناو بازنەکەی بەردەمی چالاك دەبێت.

–polar to rectangular:بەپێچەوانەی پێشەوە وێنەکە بەرەو سەرەوە خڕدەکاتەوە.

–ئەگەر گۆڕانەکەمان بەدڵبوو okکلیك دەکەین وەبەپێچەوانەوە cancelکلیکدەکەین.




@@@@

***ripple**: بەهیۆیەوە دەتوانین دەستکاری وێنەیەك بکەین وشەپۆلی هێشی تیادروست بکەین کەلەبەکارهێناندائاسانەوبهۆیamountوە کەمی یەکەی دیاری دەکەین وەلەsizeدا حەجمێك هەڵدەبژێرین کە گەورەو بچوك وناوەنی تیادایە،وەلەکۆتایداokی دەکەین.



*shear:بەهۆی ئەم فەرمانەوەدەتوانین دوو گۆڕانی ناوازەو ،جوان ئەنجامبدەین کە هەریەکەیان جێگەی بایەخی خۆیەتی و،هەبوونیان گرنگەلە فۆتۆشۆپ دا،دوای ئەوە کلیك لەسەر فەرمانەکە دەکەین پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە ،کەوێنەچالاکەکەی سەرشاشەکە لەبەشێکیدا دەردەکەوێت ،کەدەکەوێتە خوارەوەی پەنجەرەکەو گۆڕانەکەیلەسەر دەردەکەوێت بەرلەوەیokی بکەین و،نقڵی بکەینەسەر وێنە چالاکەکەی سەر شاشەکە.

دیارە بەهۆی ئەم فەرمانەوەو ، بەهەڵبژاردنیwarp aroundلەبەشیundefined areaدەتوانین وێنەیەکی دیکەبۆ وێنە چالاکەکەدروست بکەین بەهۆی چەماوەکەوە ،کەلێرەدا ئێمەوێنەی ماتۆڕێکمان بەکار هێناوەو،کەوێنەکەمان بۆ دروستکردووە بەوشێوەیەی کەباسمانکرد ،وادەردەکەوێت کەوێنە دروستکراوەتازەکە وێنەی ماتۆڕێکی ترەو خۆی لەوێنەکەدا هەیە.

وەدەتوانین pixels repeat edgeهەڵبژێرین و ،لەم کاتەدا وێنە دروستبووەکە وەك سێبەرێکی لێدێت ودەبێتە وێنەی گیڤەیەکی خەیاڵی ماتۆڕەکە .وەئەم فەرمانە بەشێوەتریش کار دەکات واتە گۆڕانی وردتری پێدەکرێت،کەبەپێویستی نازانم زۆر درێژەی پێبدەم بەلاّم ئەو بەڵێنەبەزانستخوازان و،هێژایانی خوێنەر دەدەم کە کە ئەم فەرمانەو هەموو ئەو فەرمانانەی تریش کەبەوردی باسم نەکردووەو زۆر ڕوونەچووم بۆی لە کتێبی دوواتری فۆتۆشۆپدا کەلەگەڵیدا باسی ئای کاند وشتی تریشدەکەم ،ئەگەر خوای گەورە تەمەن بدات زۆر زۆر بوردترو باشترباسیدەکەم.

ئەگەر پەشیمان بووین لەو گۆڕانەی کەکردوومانە ئەوا کلیك لەسەر defaultsدەکەین ،بۆ ئەوەی شێوە دەستکاری کراوەکە لابچێت وبتوانین جارێکیتر دەستکاری بکەینەوە .

وەلەکۆتایداokی دەکەین تاکارەکەمان بچێتە سەروێنە چالاکەکەی سەر شاشەکە ،وەبەپێچەوانەوە cancelکلیك دەکەین.



***spherize**:وەك فەرمانی pinchوەهایە.

@@@@

***twirl**:بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین گێژەلۆکەیەك لە وێنەکەی بەردەستماندا درووست بکەین کەبەهۆی فەرمانی گۆشەangleوە دیاری دەکەین کە خولخواردنەکە چۆن بێت بەگۆشەی سالیب بێت یان گۆشەی مووجەب.

وەبەهۆی هێماکانی+و– دەتوانین وێنەکەلەناو پەنجەرەی فەرمانەکەدا گەورەبکەین یان بچوکبکەینەوە.

ئەو گۆڕانەی بەهۆگۆشەکەوە ئەنجامی دەدەین بەرلەokی کردن لە سەر وێنەکەو لەناو چوار گۆشەسپییەکەتەنیشت angleدا دەردەکەوێت .

لەکۆتاییدا okی دەکەین ئەگەر بەدڵمان بوو ،یان cancelدەکەین وپەشیمان دەبینەوە ئەگەر بەدڵمان نەبوو.




@@@@

***wave**:ئەم فەرمانە بۆ دروستکردنی شەپۆل بەکاردەهێنرێت.

@@@@

***zigzag**: بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین شێوەیەکی زیکزاکی لەوێنەکەدادرووست بکەین کەبایەخی خۆی هەیەو جوانی دەبەخشێت بەوێنەکە،بەم شێوەیە:

–هێماکانی–و+ :بۆ گەورەکردن وبچوککردنەوەی وێنەکە بەکاردەهێنرێت لەناو پەنجەرەی فەرمانەکەدا.

–amount:بەهۆیەوە ڕێژەی کەمییەکە دیاری دەکەین ،کەئایا چەند بێت کەمبێت یان زۆر ،سالیب بێت،یان مووجەب.

–ridges:بۆ دیاری کردنی زنجیرەی لوتکەی ڕێژەکەی دیاری دەکەین.

–style:لەشی مۆدێل دا ،یەکێك لە مۆدێلەکان هەڵدەبژێرین کەسیَ مۆدێلمان هەیە:

–around center:بەدەوری چەقدا.

-out from center:دەرەوە لە چەقەوە،وە.pond ripples

-لەکۆتایداokکلیك دەکەین ئەگەر کارەکەمان پێجوان بوو ،وەبەپێچەوانەوە cancelکلیك دەکەین ،ئەگەر ویستمان لەکارەکە پاشگەز ببینەوە و،ئەنجامی نەدەینە سەر وێنەکە.




**************

٩-noise:ئەم فەرمانەش وەك هەریەك لەفەرمانکانی لیستی filterدەکرێت بەچەند بەشێکەوە کەلەلیستێکدا دەردەکەوێت ،بەم شێوەیە:

*add noise:واتە ئیزافەکردن،کەبەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین گۆڕان لەوێنەی چالاکی سەرشاشەکەدا بکەین کەدەتوانین بلێین وێنەکە تاڕادەیەك پەڵە پەڵەی ورد وردی تیا ڕوودەدات ،واتە کونج کونج دەبێت کە بەکارهێنەر زیاتر لەکاتی نموونە ئەنجامدانەدا بۆی ڕوندەبێتەوە کەبەهۆی amountوە کەمیەکەی دیاری دەکرێت،وەکلیك لەسەر یەکێك لەuniformو gaussian وmonochromaticهەڵدەبژێرین.

وەبەهۆی+و- وێنەی ناو پەنجەرەی فەرمانەکە گەورە یان بچوکدەکەینەوە بەگوێرەی پێویست.

دەتوانین کلیکی چوار گۆشەی بەردەمpreviewبکەین هەتاوەکو بەرلەokی کردن گۆڕانەکانمان پیشانبدات لەسەر وێنەکان.

لەکۆتایداokی دەکەین ئەگەر کارەکەمان پێجوان بوو وەبە پێچەوانەوە cancelدەکەین ئەگەر کارەکەمان پێجوان نەبوو.




@@@@

*despeckle:بەكليك كردنى گۆڕانى خۆى لەوێنەكەدا ئەنجامدەدات بێئەوەى پەنجەرەى تايبەتى بۆ بكرێتەوە.

@@@@

*dust & scratches:فەرمانى تۆز وروشاندن ،كەبەهۆيەوە دەتوانين وێنەبەشێوەيەكىكەم يان زۆر بروشێنين،كە بەكليككردنى پەنجەرەيەكمان بۆ دەكرێتەوە كە پێكهاتووەلە:

+(−)و(+): ئەم هێمايانە بۆ گەورەكردن و،بچووككردنەوەى وێنەى ناو پەنجەرەى فەرمانەكە بەكار دەهێنرێت.

+لەraduseدا ڕێژەيەك دياى دەكەين.

+بەهۆى فەرمانى thresholdوە ڕێژەى داڕوشانەكە ديارى دەكەين، ،ديارە بەتەنسيق لەگەڵradusدا.

+لەكۆتايىداokى دەكەين بۆ ئەوەى گۆڕانەكەمان بۆ بخاتە سەر وێنەچالاكەكەى سەر شاشەى بەرنامەكە.

+ئەگەر ويستمان كارەكە نەكەين ئەوا كليكىcancelدەكەين.

**سەرنج______١٤______:**

دەتوانين كليكە چوار گۆشەى بەردەم previewبكەين بۆئەوەى بەرلەokى كردن گۆڕانەكەلەسەر وێنەكە دەربكەوێت.




@@@@

***median**:بەهۆی ئەم فەرمانەوە و،بەجێبەجێکردنی شێوەیەکی مۆمی وەردەگرێت،کەبەکار هێنانی ئاسانە و،بەهۆی raduseوە ڕێژەکەی دیاری دەکەین و،هیچی‌تر ،ئیدی کارەکانی تری وەك پەنجەرەکانی پێشووە.

**********

**pexilate-١٠**:ئەم فەرمانەش لیستێك فەرمانی لێدەبێتەوە بەم شێوەیە:

***color half tone**:بەهۆیەوە دابەش بوونی ڕەنگەکان دیاری دەکرێت.

@@@@

***crystallize**:بەهۆی ئەم فەرمانەوە وێنەکە دەکەینەکریستاڵی ،بەم شێوەیە:

+بەهۆی+و– وێنەکە گەورەیان بچوکدەکەینەوە ،کەلەناو پەنجەرەی فەرمانەکەدایە.

+بەهۆیcell sizeوە حەجمی خانەکان دیاری دەکەین.

+ok:کلیکی لەسەر دەکەین لەکۆتایدا.

+cancel:ئەگەر وێنەکەمان بەدڵنەبوو بەو دەست کاری کردنەوە کلیکی دەکەین تاوێنەی سەر شاشەی بەرنامەکە وەك خۆی بمێنێتەوە.




@@@@

***facet**:کەمێك وێنەکە تۆخ دەبێتەوە بەکلیککردن لەسەری.

@@@@

***fragment**:کەمێکوێنەکە تەڵخ دەکاتە.

@@@@

***mezzotint**:ئەم فەرمانە لەچەند شێوەیەکی ئامادە کراو پێکهاتووە کەدەتوانین بەپێی پێویست بیدەین بەوێنە چالاکەکەی سەر شاشەکە بەهەڵبژاردنی شێوەیەکو جۆرێك type،پاشان okکردن.

@@@@

***mosaic**:بەهۆی ئەم فەرمانەوە وێنەکە دەکینە چوار گۆشە چوار گۆشە بەشێوەیەك کەنەناسرێتەوە وەك چۆن بۆ داپۆشینی کەسانی تاوانبارو ،خراپەکار بەکار دەهێنرێت یان بەهۆی کاری تایبەتەوە،ئەمیش بەدیاری کردنی قەبارەی خانەکان لەبەرامبەر چوارگۆشەدا،واتە: cell size\ square.

@@@@

*pointillize:بەهۆی ئەم فەرمانەوە خلّی ورد وزۆر دەدەین بەوێنەکە دەتوانین بەهۆی cell sizeوە حەجمی خانیکانی دیاری بکەین.

**********

**render-١١**:ئەم فەرمانەش لیستێك فەرمانی لێدەبێتەوە بەم شێوەیە:

*clouds:بەکلیککردنی ئەم فەرمانە وێنەکەدیارنامێنێ و،بەو ڕەنگە یان ڕەنگانە دادەپۆشرێت کە لەبەشیforegroundو back groundدا چالاکن.

@@@@

*different clouds:واتەجیاوازی و ،لەمبارەدا ڕەنگەکان هەموو وێنەکەداناپۆشێت بەڵکو وێنەکە بە دیاری دەمێنێ ،وەلێ ڕەنگی لێدەنیشێ.

@@@@

*fibers:لەم بارەشدا بەڕەنگ دایدەپۆشێ بەلاّم دەتوانین دەستکاری ڕێژەکەی بکەین،واتە زیاد وکەمی بکەینەوە.

*lens flare: بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین ڕوناکی یەك بدەین بەوێنەکەی بەردەستمان کەزیاتر شێوەی خۆرێك وەردەگرێت و جوانی یەکی زۆردەدات بەوێنەکەبەم شێوەیە:

+دیاری کردنی شوێنی ڕوناکیەکە کەلێرەدا ئێمە لەسوچی لای چەپ دامانناوە،وەشوێنەکەی بەهۆی ئەوهێمایەوە دیاری دەکرێت کەدەردەکەوێت لەسەر وێنە و،بەشێوەی +وایە.

+brightness:بەهۆی ئەم بەشەوەکمی و،زۆری ڕوناکیەکە دیاری دەکەین.

+بەهۆی lens typeوە شێوەیەك هەڵدەبژێرین کە بەرنامەکە چەند شێوەیەکی ئامادەکراوە بۆ داناوین تیایدا.

+ok:کلیك دەکەین ئەگەر گۆڕانەکەمان پێجوان بوو ،وەبەپێچەوانەوە cancelدەکەین.



@@@@

*lighting effect:بەهۆی ئەم فەرمانەوە کاریگەری ڕوناکی لەسەر وێنەکەمان دیاری دەکەین،کە چۆنبێت .لەکۆتایداokی دەکەین.

*********

١٢-sharpen: ئەم فەرمانەش وەك فەرمانەکانی تر لیستێك فەرمانی لێدەبێتەوە کە چوار فەرمانەو ،دەتوانین بەهۆیانەوە دەستکاری ڕەنگی وێنەکە بکەین و،بەگوێرەی پێویست گۆڕانێکی کەمی تیائەنجامبدەین ،وەڵێ لەبەر گرنگ نەبوونیان باسیان ناکەم و لەسەریان ناوەستم ،هەم لەبەر نەبوونی کات ،وەهەم لەبەرئەوەی کتێبەکە زۆر گەورەنەبێت و هەڵیدەگرین بۆ کات و شوێنێکی دی. چونکە ئەم بەرهەمەو،بەرهەمەکانی دیکەشم لەسەر ئەرکی خۆم لەچاپداوە.

**********

١٣-sketch:ئەم فەرمانەوەك فەرمانەکانی لیستیartisticوایە بەشێوەیەکی گشتی بۆیە بەپێویستی نازانم باسیانبکەمەوە.

***********

١٤-stylize: ئەم فەرمانەش وەك فەرمانەکانی تر لەچەند بەشێك پێکهاتووە،کەبەشێوەی لیستێك ڕێکخراون،کەیەك یەك وبەپێی پێویست باسیان دەکەین و،لەسەریان دەوەستین بەم شێوەیە:

*diffuse:بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین چەند فەرمانێك بدەین بە وێنەکەی سەرشاشەکە کەلەپەنجەرەی فەرمانەکەشدا هەیە و،بەهۆی+و-دەتوانین گەورەی بکەین یان بچوکی بکەینەوە،وە بەکلیك کردن لەناو چوار گۆشەی بەردەمpreviewگۆڕانەکەمان بۆ دەردەکەوێت لەسەر وێنەکە بەر لەوەی okی بکەین،بەشەکانی ئەم فەرمانە چواردانەیە کەدەکەوێتە ژێرخانەیmodeوە کەپێکهاتووەلە:

+normal:واتە ئاسای.

+darken only:واتە تەنها کەمێك وێنەکەمان بۆ تەڵخ وتاریك دەکات.

+lighten only:تەنها کەمێك وێنەکەمان بۆ ڕووندەکاتەوە.

+anisotropic:هەموو وێنەکەمان بۆ تاریك ناکات بەڵکو بەشێکی واتە نیمچەتاریك بوون ڕودەدات.

+لەکۆتایداکلیکیokی دەکەین،وەئەگەر فەرمانەکەمان بەدڵ نەبوو کلیکیcancelدەکەین.




@@@@

*emboss: ئەم فەرمانە بەکاردێت بۆ گۆڕینی وێنە بۆ شێوەیەکی تایبەتی کەدەڵێیت وێنەی نەقاشەکانە و،بەکارهێنانی جێگەی بایەخە دەبێت بەوردی لێی بدوێن ،کەوەك پەنجەرەکانی تر پێکهاتووەلە:

+هێماکانی +و- : بەکاردەهێنرێت بۆ گەورەکردن وبچوککردنەوە وێنەکە لەناو پەنجەرەی فەرمانەکەدا.

+angle: بەهۆیەوە گۆشەی جێبەجێکردنی فەرمانەکەی پێدیاری دەکەین.

+height:واتە بەرزی کەبەهۆیەوە بەرزی پێدیاری دەکرێت بەنووسینی لە ناو چوار گۆشەبچوکەکەی فەرمانەکەدا ،کەلەبەردەمیایەتی .یان بەهۆیگۆڕانی ڕێژەکەی بەزیاد و،کەمکردنی.

+amount:بەهۆیەوە ڕێژەی کەمیەکە دیاری دەکەین.

+preview: بەکلیککردن لەناو چوار گۆشەکەی بەردەمیدا چالاك دەبێت و گۆڕانەکەمان پیشاندەدات بەرلەوەیokی بکەین.

+لەکۆتایداokی دەکەین ئەگەر مەبەستمان بوو.

+وەئەگەر نەمان ویست کارەکە ڕووبدات کلیکیcancelدەکەین.




@@@@

*extrude:بەهۆی فەرمانەوە گۆڕان ئەنجامدەدەین بەدوو شێوە ،ئەویش بەهەڵبژاردن ودیاریکردنی بەشەکانیtypeجۆر و حەجمsizeو قوڵی deep.

*edges: بەهۆی ئەم فەرمانەوەو بەکلیك کردن لەسەری دەتوانین وێنەکە لەڕەنگ پاك بکەینەوە و،بەمەش وێنەکەتەنها چوار چێوەکەی دەمێنێتەوە.

@@@@

*glowing edges:کەکلیك لەسەر ئەم فەرمانە دەکەین پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە کە لەبەکارهێنانەدا وەك پەنجەرەی بەشەکانی artisticوایەو ،وێنەکە ڕەش دەبێت وڕەنگەکانی دیکەی تیانامێنێت و،تەنها هێڵو قەراغی وێنەکە دەردەکەوێت کەدەتوانین دەستکاری بکەین و،پانی بکەین یان باریکی بکەینەوە یان ڕوناکی بکەینەوە یان بەپێچەوانە،وەهەروەها .

@@@@

*solarize:ڕنگی وێنەکە تەڵخ دەکاتو تۆخی دەکاتەوەو،گۆڕانی تیا ئەنجامدەدات.

@@@@

*tiles: ئەم فەرمانە سودی لێوەر دەگیرێت بۆ پڕکردنەوە وئاخنینی ناوچەیەك لە، چوار باری دیاری کراو ،کەفێرخواز لەکاتی تاقی کردنەوەدا فێریان دەبێت بەسەرنج دانی ورد.

@@@@

*trace contour: ئەم فەرمانەش بەهۆیەوە گۆڕان لەرەنگدا دەکرێت .

@@@@

*wind:با ،ئەم فەرمانە بەکار دەهێنرێت بۆ دروستکردنی شێوەیەکی خۆی ئامادەکراو ،لە(با)کە میتۆدی کارەکە سێ شێوەیە و،بەدوو ئاراستەی ڕاست و،چەپیش دەبێت،بەم شێوەیە:

+هێماکانی +و–:بەکلیککردنیان وێنەی چالاکی ناو پەنجەرەی فەرمانەکەمان بۆ گەورە دەبێت،یان بچوك دەبێتەوە.

+method:سێ شێوە لەخۆدەگرێت:

–wind:شێوەی بایەکمان بۆ وێنە دەکیشێت لەسەر وێنەکەی بەردەستمان ،بەلاَم شێوەکە خۆیەو،زۆرناتوانین دەستکاری بکەین تەنها ئاڕاستەکەی نەبێت کەئایا لای ڕاستەوە بێت،یان چەپ.

–blast:دەتوانین بلێین ئەم فەرمانە شێوەی بایەکی توند دەداتە وێنەکە،کەهەندێك جار لەتەقینەوەش دەچێت.

–stagger:ئەم فەرمانە وێنەکە بەلادا دەخات کە شێوەیەکی جوان و نیاب دەبەخشێتە وێنەکە.

+direction:واتە ئاڕاستەی شێوە خۆییەکان ،کەدوو ئاڕاستەیەوبەکلیك کردنی بازنە بچوکەکەی بەردەمیان چالاك دەبێت ئەوانیش:

–from the right:واتە ئاڕاستەکەی لەڕاستەوە بێت.

–from the left:لە چەپەوە.



**********

١٤–**texture**:ئەم فەرمانە لیستێك فەرمانی كەلەبەرئەوەی بەكارهێنانیان وەك فەرمانەكانی لیستیartisticوایە باسیا ناكەین ،دیارەلەبەر ئەوەی كتێبەكە زۆر گەورەنەبێت،ئەمە جگەلەنەبوونی كات،وەڵێ بەڵێن دەدەم كە پشت بەخودای میهرەبان ،بەرهەمی داهاتووی فۆتۆشۆپم قوڵبوونەوەیەكی زۆر زیاتر بێت بەپشت بەستن بەچەند سەرچاوەیەكی ئینگلیزی.

************

١٥–**other**:بەهۆی ئەم فەرمانەوە گۆڕانی تر ئەنجامدەدرێت،بەم شێوەیە:

***custom**:بەهۆی ئەم فەر مانەوە دەستكاری ڕەنگی وێنەكەی بەر دەستمان دەكەین،كەبەكلیك كردنی پەنجەرەیەكمان بۆ دەكرێتەوە كەپێكهاتووە لە كۆمەڵێك لاكێشە و،خۆمان ژمەی تیا دەنوسین جابە سالیب بێت یان موجەب،بەگوێرەی پێویست كەبەپێی ئەو ژمارانەی دەینوسین بەر نامەكە گۆڕانمان بۆ ئەنجامدەدات لە ڕەنگی وێنەكەدا.

وەدەتوانین ئەم گۆڕانە بەهۆیsaveوە بپارێزین،كەپاشان دەتوانین بەهۆی فەرمانی loadەوە بیكەینەوەو بەكاری بهێنینەوە.

@@@@

***high pass**:بەهۆیەوە وێنەكەمان بۆ تەڵخ دەكرێت بەشێوەی چین كەبەكەمكردنەوەیradusدەبێت ،وەبەپێچەوانەوە وێنەكە وەك خۆی دەبێت ،واتە كەمتر تۆخ دەبێت.



***maximum**:بەهۆیەوە دەستكاری ڕەنگی وێنەكە دەكرێت ،كەبە زیاد كردنی ڕەنگی وێنەكە تێكدەچێت و،تاڕادەیەك وەك چوار گۆشە چوارگۆشە دەردەكەوێت.

@@@@

***minimum**:بۆ كەمكردنەوەی ڕەنگ بەكار دەهێنرێت.

@@@@

***offset**:ئەم فەرمانە بەكار هێنانی گرنگی هەیە بۆیە بەوردی باسی دەكەین،بەم شێوەیە:

١-ئەگەر لەبەشی undefined areasدا فەرمانی set to backgroundچالاك بكەین بەهۆی كلیك كردنی بازنە بچوكەكەی بەردەمی‌یەوە،ئەوادەتوانین بەهۆی فەرمانی horizontalوە هەموو وێنەكە بەئاسۆی بجولێنین واتە بەرەو ڕاست یان چەپ،وەبەهۆی verticalوە بەشاوڵی هەموو وێنەكە بجوڵێنین واتە بۆ سەرەوە وبۆ خوارەوە.لەم بارەدا ڕەنگی باكگراوەندی بەرنامەكە جێگەی وێنەكە دەگرێتەوە ئەگەر هەموویمان لادابێت،وەهەروەها.

٢-ئەگەر لەبەشی undefinedدا فەرمانیrepeat edge pixelsچالاك بكەین بەكلیككردن لەناو بازنەكەی بەردەمی ،ئەوادەتوانین وێنەكەهەمووی بەبێ‌باكگراوەندی وێنەكە بجوڵێنین بەشێوەی ئاسۆی بەهۆیhorizontalوە ،وەبەشێوەی شاوڵی بەهۆیverticalوە.

٣-ئەگەر لەبەشی undefinedدا فەرمانی warp aroundهەڵبژێرین ئەوا دەتوانین بەدەوری باكگراوەندی وێنەكەدا گۆڕان بكەین و،بەهۆی horizontalوە وێنەی سەرباكگراوەندەكە دەكەینە دووان بەشێوەیەكی ئاسۆی ،كەدەتوانین هەمان وێنە بەهۆی verticalوە بكەین بەدووانەبەشێوەیەكی شاوڵی ،وەدشتوانین لەیەككاتدا هەردوو شێوەكە ئەنجامبدەین وەك لەنموونەكەدا دیارە.






# ➢ لیستی پیشاندان view



## سەرنجـــــــــ١٥ـــــــــ:

لەرئەوەی بەشەکانیviewوwindowوhelpزۆرگرنگ نین و،بەکارهێنانیان ئاسانەتەنها ئاماژەیەکی کورتیان پێدەدەم.

**١-proof setup:ئەم فەرمانە لیستێك فەرمانی لێدەبێتەوە ،بەم شێوەیە:**

***custom:بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین گۆڕان لە ڕەنگی وێنەکەی بەردەستماندا بکەین و شێوەیەکی ڕەنگی خۆی لەprofileبۆ هەڵبژێرین ،کەدەتوانین تەنها ئەم بەشەچالاك بکەین بەکلیککردنی چوارگۆشەبچوکەکەی بەردەمpreserve color numberو،وێنەکەبەهۆیsaveوە خزنبکەین،وپاشان بەهۆیloadوە بیکەینەوەو،بەگوێرەی پێویست سودی لێوەر بگرین،وەدەتوانین کلیك لەناو چوارگۆشەی بەردەمpreserve color numberنەکەین بۆئەوەی بەشیintentچالاك بێت و،یەکێك لەفەرمانەکانی هەڵبژێرین بۆ کارەکەمان،کەلەم کاتەدابەشەکانی ژێر intentبەگوێرەی هەڵبژاردنەکانی profileوintentچالاك دەبێت.**




@@@@

***working cmyk:واتە کارکرن بەگوێرەی چوار ڕەنگەکە،وەهەروەها بەشەکانی دیکەشworking cyan plateوworking magenta plateوەهەروەها ،هەریەکەو کارکردنە بەپێی ڕەنگێکی دیاری کراوی فەرمانەکە کە فێرخواز خۆی دەتوانێ یەك یەك تاقییان بکاتەوە،و لەبەرگرنگ نەبوونیان باسی ناکەین.**

******

